٢٠٦



# زەنگوڵە

وەرگێڕانی

غەریب پشدەری

٢٠٠٥ هەولێر

# زەنگوڵە

## کۆمەڵە چیرۆک

وەرگێڕی/ غریب پشدەری

٢٠٠٥/ هەولێر

وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتیی گشتی دەزگای چاپەمەنی و بڵاوکردنەوەو دابەش کردن

- کتێب : کۆمەڵە چیرۆک / زەنگوڵە
- زنجیرەی کتێب : (٢٠٦)
- وەرگێڕانی : غەریب پشدەری
- چاپ : یەکەم
- ژمارەی سپاردن بەکتێبخانەی نیشتمانیی کوردستان : (٦١٠) ساڵی ٢٠٠٥
- هونەرکاری بەرگ و ناوەڕۆک: شێروان فاروق
- سەرپەرشتی چاپ : سەعد شکاک
- چاپ : بەڕێوەبەرایەتیی چاپخانەی رۆشنبیری/ هەولێر
- تیراژ : ٥٠٠ دانە
- نرخ : ١٠٠٠ دینار

# پێرست

بۆ:

**(شەرا)ی گەرمەسێری وشە کوێستانییەکانم**

**دیاری)و یادگارە**

(غەریب)

((نەنەگیان ئێوە وە بیرتان نایە. تازە دووسێ ساڵ بوو مێردم کردبوو حاجی ئەزغەرم تازە لە مەمکێ بڕیبۆوە و زگم بە ڕوقیایە هەبوو ..)).

پووریلە ئاوای دەست بەقسان کرد. شەوێکی مانگی ڕەمەزانێ بوو هاتبووە ماڵێ مەودوای فتار کردنەوێ، مەعسوومە سوڵتان چوو نێرگەلە مل درێژە کدوو ئاساییە زۆر جوانەکەی، کە شەوانی لە خۆدان و لاواندنەوێ لە مەجلیسێ دادەنرا هێنای تووتن و ئاگری بۆ وەسەرکرد و لەبەردەمی داناو، ئەویش هەربەو شێوەیەی کە قامیشی دەسکی نێرگەلەکەی دەدەمیدا بوو درێژەی دایە:

(( .. هەر لەو کۆڵانەی سەید وەلی کە ئەودەم تازە کێلی گۆڕەکەی وەدی هاتبۆوە و من بۆ خۆم دەگەڵ نەنکم پێکەوە چووینە سوێی، لەبەری مرم. بە قوربانی بم. لەسەر ئەوکێلە مەڕمەڕیە، دەپازدە دێڕیان بەخەتی عەرەبی لەسەر نووسیبوو بەڵام من هەرچیم کرد و کۆشا نەمتوانی بیانخوێنمەوە هەرچەندە ئەو دەمی وەک ئێستا چاوم کزنە بوو بوو و قورئانم لە نەنکم چاکتر دەخوێندەوە. بەڵام خەتی سەر ئەو لاکێلەم هەرپێ نەخوێندرایەوە .. بەڵێ چم دەگوت .. ئا هەرلەو کۆڵانەشدا کاروانسەرایەکی کاول و وێرانە و چۆڵ و هۆڵی کابرایەکی پیرە مێردە هەبوو کە هەمیشە خواخوای بوو یەکێکی لێ هەڵکەوێ لێی بکڕێ و لە دەستانی وەحەسێ ..)) پووریلە دوای ئەوەی چەسپێکی زۆر درێژی لە قلیانەکەی دا، تێیڕا دیار بوو کە زۆر لە نەفەسدانی ئەو نێرگەلەی ڕازیە. هەردوای هەناسە تازەکردنەوێی گوتی: ((ئەو دەمی لەو گەڕەکەی مە پیرەکچێکی قەیرەی ترشاوی لێبوو ناوی بە توول بوو. ئێستاش نەمانزانی لەکوێرا هاتووە. چاکم لە بیرە ڕۆژانی جەژنی ڕەمەزانێ پارچەی لێرەو لەوێ کۆدەکردنەوە لە مزگەوتی ((کوچە دەردار)) کە نوێژ تەواو دەبوو دەیبەشینەوەو دەیکردنە خێری شووکردنێی، بەڵکەئێ، ئەوە خوایە، بەڵام بێسوود بوو بەختی کوێر ببۆوە. بۆ خۆشی دەیگوت: نازانم، خوادەزانێ دەڵێی تەلیسم و جادوویان لێکردووم، جا هەرچی بێ. خۆ هیچم لە دەست نایە. خواش بۆ خۆی کەیفی خۆیەتی دەیانبەخشێ .. نایانبەخشێ چیان لێدەکا بابیکا. بەکورتی بیهێنینەوە ئاخری و ئۆخری هەتیمچەیەکی بەدبەختی لێ پەیدا بوو و پێوەبوو!)) چەسپێکی دیکەشی لە قلیانەکەی داو ئینجا:

((سەرەنجام کۆڵان گەڕێک کە هەمیشە لەو کۆڵانانەی مەدا دەهات و دەچوو و خرت و پرت و تەڵەومەڵەی مشکانی دەفرۆشت پەیدا بوو و هێنای. ئێمەشی پێ خۆشحاڵبووین کەخوا دەرکەی لە بەتووڵی کردۆتەوە. ڕۆژێکی کە تازە دەهات خەڵکی ئاهێکیان تێگەڕێ و حاڵ وباڵیان نەختێک لەبارتر بێتەوە، کابرایەکی قەنندادی کەلە و دۆست و ئاشناو

ڕۆشنا دێرینانەی مێردی بەتوولێ دەبێ، ڕاستی لە بیرم چوو ناوەکەی بڵێم ئاواڵی مەشەدی حەسەن دەبێ و لەسەری کۆڵانێ تێک هەڵدەنگون و چاویان پێک دەکەوێ و دەڵێ، ئەگەر بتوانی بۆشەوی جێژنێ پارەک مارەکی پەیداکەی من شارەزام و وەستام و دەزانم دووسێ جۆر شیرینی و پاقلاوەو نانە برنج و ئەو شتانە دروست کەین، بەڵکەئێ خوا کەرێمە بارمان ڕاست کاتەوە. مەشەدی حەسەن ئامادەیی خۆی پێشاندەداو بەولاولادا هەڵدەسووڕێ و هەرچۆنێک بووە شتێکی کەم یا زۆر پارەو پولێکی پەیدا دەکا. دەست دەکەن بەشتومەک کرینێ و دەیانەوێ دەستکەن بە دروست کردنی شیرینەمەنییە. بەڵام نازانن دووکان و جێ و ڕێیەکی چۆن پەیداکەن؟ مەشەدی حەسەنە دەبیر و لێکدانەواندا بەبیریدادێت کەبچنە ئەو کاروانسەرا چۆڵ و هۆڵ و پان و بەرینە و لەلایەکییەوە مەنجەڵ و شرە و برەی لێ بەعەردی دادەن و و دەست پێبکەن. پێکەوە دەچنە لای پیرەمێردە و سەرو بنی کارەکەیانی تێدەگەیەنن و بریاری لەگەڵ دەبەستن مانگێ دوو قرانانیش کرێ بدەنە وی. بەڵام پیرەمێردە دەڵێ من هەرگیز پارەم ناوێ و ئێوە وەرن لێرە کاری خۆتان بکەن و خواش گەورەیە بۆ من ..)).

نازانم پووریلە، لە کەنگێوە گوێیەکانی کەڕبوو ون و ئێمەش بۆ ئەوەی هێندەی پرسیاران لێ دووپات نەکەینەوە ناچارین بێ هەست و خوست لەبەرامبەری دانیشین و گوێ هەڵخەین تاچاک گوێمان لە قسەکانی بێت و تێی بگەین. ئەو هێندە خۆش و لەبارو بەتام و خوێ قسان دەگیرێتەوە، تەنانەت ئەو منداڵانەی کە پێش تاوێکیش ئەو ناوەیان هەژاندبوو ئێستا هەموو بێدەنگ و بێ هەست و چرپە گوێیان ڕاداشتووە و دانیشتوون. لەو ناوەدا تەنیا لرفە لرفی ئاوی نێرگەلەکەی پووریلێ بوو کە جارجارە بەرز دەبۆوە و هەر دەوودەمیشدا هەراو هوریای منداڵانیش هەروەتر لەسەر شەوچەرەی بڵند دەبۆوە و پێکدا دەهاتنەوە و دەبووە جەنگی مەغلووبەی پوربلە چەسپێکی دیکەی لە قلیانەکەی دایەوە و پێداهاتەوە:

((.. سەرتان نەیەشێنم، مەشەدی حەسەن و شەریکەکەی چوونە دەکاروانسەرایەکێ ولایەکیان بۆ مەنجەڵ لێ وەسەرنانێ دیاری کرد بیکەنە وەجاغ. هەر لەگەڵ پاچی یەکەم و دووەمدا نووکی پاچێ لەزالکی کووپەڵە زێڕێکی گەورەگیر دەبێ. لەسەرخۆ ئەولاولای دەدەنەوە تادەبێتە کەندرو کونێکی زالک گەورەوبەرین..!)) ئەودەمی هەموو شتێکی تێدەگەن. مەشەدی حەسەن خێرا ئاواڵەکەی تێدەگەیەنێ کە دەبێ زۆر ووریا بن. پیرەمێردە بۆ نوێژی عەسرێ چۆتە مزگەوتێ، دەرکی کاروانسەرای گاڵە دەدەن و دێنەوە زگ کونەی

لێـــان داوەتەوە! دەرکـەکـەی دەبیننەوە، ژێر زەمـــینێکی وەک دالآنی دوور و درێژ وە دەردەکەوێ. مۆمێ بەدەستەوە دەگرن و دەچنە تێی سەرتاسەری ئەو ژێر زەمینەی چین چین و نهۆم نهۆم بەگەچ و بەردی هەڵنراوە و لە نێوان هەر نهۆمێکیشدا ئەوا تەشتە شتێکی وەک هەویریان داناون و هەریەکە سینیەکی گەورەشیان بەسەردا نخون کردوونەوە.

ئیدی مەشەدی حەسەن و ئاواڵەکەی لە خۆشیـان خەنی ببوون و جێیـان بەخۆ ناگرن و نازانن چ بکەن؟ لیـرە، هەریەکی بەقــەدەر ژێرپیـاڵێکی! خـوادەزانێ ئی کێ بوو ون و لەسـەردەمی چ سـوڵتـانێکەوە لێـرەدا شـاردراونەوە و هەڵگیـراون نەنکم دەیگوت ئەوە لەوانەیە هەمووی وەقفی سەید وەلی بووبن کە ئێستا ئەوا تازە کێلەکەی وەدەردەکەوێتەوە بەڵام هەرچی بووە، ئەوە بەنسیب یەکێکی دیکە بووە رۆڵەکانم ..)).

پووریلە چاوە ووردیلەکانی هێندەی دی وێک هێنابوونەوەو چەند وەختێک بێ هەست و چرپە و بێـدەنگ بوو، پێم وابوو بیـری لەو لیـرە گـەورە پان پانۆکـانەی کـە دەیگوت هەریەکـەیان بەقـەدەر ژێرپیـاڵێکی دەبوون دەکـردەوە. ئای چەند خـۆش دەبوو یەکـدانەی لەوانە بەڵێ هەریەک دانەی هەڵگرتبا و رۆژی خەتەنە سوورانی پێنجەمین نەوەی کە تازە خـــوادابووی لە بن ســـەری قـــۆنداغـــەکـــەی نابایە! یان یەک لەوان پەیکەرە زێرە (سەرقۆت)انەی لەزنجیرێکی زێرەوە کردبایە و لەگەڵ دووعای چاوەزاری ((وان یکاد)) و جووتێک گوارەی پتەو و قورس و گرانی لێ دروست کردبان و بۆ بووکی حاجی ئەزغەری کوڕی ناردبان .. ئای خوایە کە خۆش دەبوو! رەنگە بیری بۆ زۆر شتی دیکەش چووبێ ..

((بەڵێ منداڵینە کەس نازانێ بەشی خۆی لە ژیاندا چیەو چەندە؟ ئەگەر شتێک بەشی تۆبێ و بۆت برابێتەوە، سیـمورغی سەرکێوانیش ناتوانێ بێت لێت بفرێنی و بیبات بە کورتی مەشەدی حەسەنە و ئاواڵەکەی شیرنەمەنی جەژنێیـان دروستکردو، ووردە ووردەش پارە و پوولیان دەردا و بەشێـوەیەکی وا کە پیرەمێـردە پێ نەحەسێ، سێ چوار مـانگان دوای ئەوە گـوایە کـارەکـەیان سـەری گـرتووەو دەست مـایە و قـازانجـێکی زۆریان وەگـیـر کەوتووە و خوا دەرگـای بەخـێرێی لێکردوونەوە، هاتن کـاروانسـەرایەیان لە پیـرەمێـردەی کڕی. ئەویش هەر لە خـودای دەویست پارەکـەی وەرگـرت و بڕۆن خێـری لێ بینن و لێیـدا رۆیی. ووردە ووردە تا دەهات دەمـاندیت ئەوا بەتوولەش تادێ سەرو وەزع و حـاڵ و باڵی چاتر دەبێ. ئەوا ئێسـتا گەردانە و ملەگۆی قورس و سەنگین لە مل و دوو ریزە بازنەی زێڕ لە دەست و ئەنگوستیلەی ئەڵماس دەقامکان دەکات، کراسی ئەتڵەس و نەخش و نیگار کراو نەبێ دەبەر ناکا، چارۆگەی مەلمەلی سپی سپی نەبێ بەسەریدا نادا ..!

هەروەک خانمە خاسان دێت و دەچێت. ئەوەشم لەبیر چووبێلێتم، کە تازە دەهات خوا دەرکی بە خێرێیان لێبکاتەوە، بە توول کچێکی بوو و ئیدی لەو دەمیەوە منداڵی نەبووەوە)).

چەسپێکی دیکەی لە قلیانەکەدا و دووبارە:

((مەشەدی حەسەن ئاوەڵەکەی نارده کەربەلایەو بۆ خۆشی وورده وورده دەکورتانی کەرو ئێستر و بارگیرانداو دەناو کەژاوە و دۆشەکاندا ئەولیرە و پەیکەرە زێرە (سەرقۆت)انەی بۆ دەنارد تاڵەوێ ساغیان کاتەوە و بیانکاتە پارە ئەویش لەوێ دەیفرۆشتن و پارەکەی دێنایەوە. بە کورتی تا دەهات کارەکەیان چاتر دەبوو. سەرتاسەری گەڕەکەکەیان هەموو کڕی. هەرچی خزم و کەسوکاری هەژار و مەژاری خۆشیان بوو هەریەکە سەرو خانوویەکیان بۆ کڕین کەس سەرەدەری لێنەدەکردن. مەشەدی حەسەن بەخۆ و بە بەتوولی ژنیەوە چوونە سەردانی کەربەلا. چاکم لەبیرە ببوونە بنێشتە خۆشکەی سەرزاران. لەوێشرا چوونە مەککە و ئەو بەتوولەی کە کەس نەیدەزانی کێیە و کێ نیە و سەرەنجامی بەچی دەگا، بووە حاجی ژنی گەڕەکەکەی مە خوا بەنسیبی هەموو بەندەکانی خۆی کات! خودایە .. کە دڵم تەنگە. ئای هەی. ئەوا پێیەکمان لە ڕۆخی قەبری و ئەویدیمان لە سەر دنیایە. خوا دەزانێ ئەورۆ دەڕۆین سبەینێ دەڕۆین، بەڵام بەخودای ئێستاش کە ئێستایە ئەو حەزەم قەت لەدڵی ناچێتە دەرێ کە ئەو گۆڕە شەش پاڵووەی دەئامێزێ بگرم. خۆ خودایە لە خەزێنەت کەم نابێتەوە .. ئەی خۆشەویستی زەهرا ..)).

پووریلە گری دەئەوکێدا بوو، گوێگرەکان هەموو دەمیان بەش ببۆوە. نەیاندەزانی بگریەن یان نا. من وام هەست دەکرد کە ئەوان هەموو ئێستا پێیان وایە ئەوا ئاخوند لە سەرمینبەرێ خەریکی لە خۆدان و واوەیلاوشینی حەزرەتی حوسێنە. بەڵام پووریلێ زوو تێگەیی کە خەڵکەکە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری قسەو باسەکانیەوە .. بەگۆشەیەکی چارۆگەکەی چاوەکانی سڕینەوە و چەسپێکی تابلێی توندی لە قلیانەکەی دا و درێژەی دایە:

((.. حاجی ژنە بەتوول هەر لە دوای ئەو کچەیەوە کە ئێستا ئەو چواردە ساڵانەیە و تابلێی جوان و ناسک و نازدار و خڕوخۆپانەو ئەمن بۆ خۆم لەو ڕۆژانە لە حەمامێمدا دیتووە خودایە چ نازدارە .. چەندم حەز دەکرد ئێستا کوڕە جحێڵەکم هەبایە و ئەو کیژۆڵەم هاویشتبایە تەنگی باغەڵێی و لێم مارە کردبایە .. بەڵێ هەر لە دوای ئەو کچەیەوە ئیدی منداڵی نەبۆوە و نەبۆوە. وەک بەتوول بۆنی کردبێ کە حاجی حەسەن گزە

گزیەتی و بەهەویای ژنێیە.
باشە ئاخر باقستێکیش بۆ خوای بکەین. ئەویش حەزی نەدەکرد بەو هەموو شەرو سامان و دارایییەوە وەجاغ کوێر بێت و توخم و تۆرەمەی ببڕێتەوە.
بەتوول بۆخۆشی دەبێ چەند جارێکانی لە حاجی حەسەنی هەربیستبێ کە پێغەمبەر بۆخۆی فەرموویەتی تا چوار ژنان ئەوە هەر هیچ، جا ئەوە لەبەر هەندێ بوو بەتوول وەهەلەکە سەما کەوتبوو چۆن مندالێکی دیکەی ببێ و نەیەڵێ حاجی حەسەن ژنی بەسەر بێنێ. ئاخر نەنەو بەقوربان بێ ئێوە نازانن هەوێ چیە؟ ئێستا من خودا نەخواستە ژنم بەسەر بێ. چونکە ڕاستیەکەی ئەوەیە ژن چۆن ئاسوودە دەبێت بەزیندیە چاوان مێردەکەی لە باوەشی پەتیارەیەکی دیکەدا ببینێ. بۆیە هەرچی شێخ و مەلا و پیاو چاک و پڕ و پیرێژن و داو و دەرمانی کوڵانان هەیە هانای بۆ بردن و چەند جارانی نەزر و نیاز لە خۆگرتن و دەپازدە سەرمەڕی لە عەردی داو کردنیە خێرو سەدەقەی گۆڕی ((سەید وەلی)) کە زۆر لە مێژنەبوو کێلەکەی لەبن خۆڵێوە وەدەر کەوتبۆوە و شیوی (زەینەل عابدین)یشی لێناو بەشیەوەو چەند شەوانی شەموولە گرتەوە، بە کورتی ئەوەی بیانگوتبایە چاکە ئەو لێی ڕانە دەوەستا .. تا سەرەنجام خوا کردی و زگی بوو. کەزا، خوا کوڕێژگەکی کاکۆڵ زەردی زێرینی دایە ..)) دیسانەوە پووریلە بێدەنگ بۆوە و یەک دوو چەسپی عەننابی لە نێرگەلەکەی دا کە تووتنەکەی تەواو ببوو و ببووە خۆڵەمێش و هەر چزە چزی بوو و مەعسوومە سوڵتانیش بەنابەدڵیەوە، کە لە بەسەر هاتەکە دوور دەکەوتەوە، نێرگەلەکەی تاودایە و بردیە دەرێ نوێی کاتەوە و ئەویش دەستی پێکردەوە و درێژەی بەقسەکانی دا:
((.. بەڵێ نەنەگیان، خوا نەکا زەمانە پشت لە ئادەمیزاد کات و ڕووی لێ وەرگێڕێ. هەر بەڕۆژێکی ڕەگ و ڕیشەی لەبن وبێخەوە دەردێنێت و چەند ماڵە گەورە و بنەماڵەش بێ هەر هەڵێدەتەکێنێ و وەک لۆکەی پەڕە کراوەی لێدەکات و دەیکاتە خۆڵەمێش و دەیهاڕێ. بەڵێ لەبەر و گەڕێم. ووسێنی حاجی حەسەنی تازە خوادابووی کە حاجی حەسەنی داما و تووشی نەخۆشی سیل بوو! نەنگۆ نازانن نا! ئیدی هەرچی هەیبوو و نەیبوو لە خۆی خەرج کرد. هەر لە حەکیم باشی گەڕەکێوە بگرە تا دەگاتە دکتۆر مکتۆری دەرباریش نازانم، بەکورتی هەرهەموویان هێنانە سەرێ بەڵام بێسوود بوو و دادی نەدا. هەرجارەی ((ڤیزیتا))یەکی گرانبەهای دەرمانانیان بۆ دەنووسی بەڵام هەیهوهەیهو، نەخۆشیەکەی وی و ئەو دەرمانانە لە کوێ ..؟
کە خوا بۆخۆی نەیەوێ کارێکی بکا، ئەوەکێ دەتوانێ بیکا؟ ئەوەی سەرەی مردنیی

هات هەردەبێ بمرێ و ئیدی گەرانەوەی نیە! جا کە حاجی دەستی لەبنی هەنبانە بۆرینەی هاتە دەرێ و هیچی نەماو هەرچی هەیبوو لە داودەرمان و دکتۆر و حەکیمانی دا، ئەوجا مرد، و بەتوولی بێچارەی تابیناقاقای لەبن قەرزان بەجێهێشت بەتوول هەر زوو کچەکەی بەمێرد داو ئەوەندەی لەبن بەرێش مابوو، کردیە جیازی کچەکەی و وەگەڵی داو بەرێی ماڵە مێردی کرد. ئەو خانووەی تێشیدا بوو هەربووە ئی داواکاری قەرزان. چونکە خەڵکی ئەو دەمی لەهی ئێستا بەرەحمتر بوون، خانووەکەیان لە باتی قەرزی لێوەرگرت. ئەویش هێنای منداڵەکەی لەلارێیەکی فرێداو بەجێی هێشت و ئەو رۆیشتنەی رۆیشت نەهاتەوەو ونبوو! بەڵام یەک دوو ساڵان رۆژێکی کچەکەم لە شاییبووکی یەک لە دراوسێکانمان دەبینێ ئەوا بەتوول لەگەڵ چەند تیا ترۆیەکان خەریکی سەماو سوڕدان و خۆ بادانێیە))

پووریلە بێدەنگ بوو و هەمووی لە چاوەڕوانیدا هێشتنەوە چەند دەقیقێکان ئەو ناوە دەبێدەنگی و هەوت بوونێدا نقووم بوو. تا خوشکەکەم وە دەنگ هات و گوتی:

((پوورێ گیان ئێ دواییەکەی چۆن بوو))؟ پوور وەڵامی دایەوە:

((بڵێم چی نەنە ئێستا ئەویش یاوەک من پیر و کەنەفت و گوێ گران بووە یا ن ئیدی بڵێم چی لێهاتووە چووزانم، خوالەکەموو کورییەکانی ببوورێ. بەڵێ ئەگەر مردووە خوالێی خۆشبێ و ئەگەر ماویشە خوا بکا کچەکەی پێی ڕابگات و بیهێنێتەوە بن باڵی خۆی و جلەوی بگرێتەوە و داڵدەی بدا.

---

لەکتێبی/ (دیدوبازدید) جلال ال احمد چاپ چهارم: ١٣٧٦ تهران
انتشارات فردوکا چاپخانه ڕامین ەوە کراوە بە کوردی

پاسەکە پڕ بوو و کەوتە ڕێ. دوایین نەفەرێک کەسوار بوو گوڵدانێکی چینی زۆر بەنرخ و گرانبەهای کۆنینە و ئەنتیکەی بەدەستەوە بوو و زۆر بەووریایی و لەسەرە خۆییەوە هەوڵی دەدا کەبەولاولادا نەکەوێ و پارسەنگی تێک نەچێ، ڕووەو پشتەوەی پاسەکە چوو.

نەفەرەکانی دوواوە پاڵیان وێک دا و بەپاڵەپەستۆ جێی ئەو نەفەرە پێنجەمەشیان کردەوە.

پیاوی چل و ئەوەندە ساڵە، پاڵتۆیەکی پیاوانە و کڵاوێکی تازە و پاک و خاوێن لەسەر. ئەو دەستەی گوڵدانەکەی پێگرتبوو دەستکێشێکی قایشی نوێی تیدا بوو لەسەر کوشنی پشتەوەی پاسەکە چوار نەفەری دیکە، دوو ژنی چارشێو بەسەر کە هەدووکیان سەریان پێکەوە نابوو و هەر وورتە وورت و مینگە مینگیان بوو، ئەو دووەکەی دیش، یەکێکیان پیرەمێردێکی تەڕپیرو ڕۆشنبیر، و ئەوی دیشیان پیاوێکی بێ چاو ڕووی ڕوو هەڵماڵدراو و بێ بەندو باوی کراوە بوو بێ یەخەو بێ بۆینباغ. سەردەستەی کراسە بێ قۆپچەکانی لەبن سەردەستەی قەمسەڵە شڕو وورەکەیەوە هاتبوونە دەرێ. مووەکانی قژە سەری لە کونی کڵاوە پەڕپووتەکەیەوە سەریان وەدەرنابوو. ڕیشە ماش و برنجیەکەشی هەموو ڕووی تابن خەتەکانی چاوی داپۆشیبوون. کاتێ ئەو پیاوە گوڵدان بەدەستە پاک و خاوێنەی لە تەنیشتەوە دانیشت، تەواوی هەست و نەست و بیرو هۆشی پەڕیەسەر ئەو گوڵدانە و لەو گوڵدانە بەولاوە ئاگای نەک هەر لە هیچ لە خۆشی نەما. خاوەن گوڵدانەکە بێدەنگ دانیشتبوو. گوڵدانەکەی لەسەر ئەژنۆیەکانی خۆی دانابوو. دەسکەکەی توند گرتبوو. بەدەستەکەی دیکەشی کەبێ دەستکێش بوو یاری بەو چەند ووردە پارانەی ناو دەستی دەکرد. پیاوەکەی دیش کە بەتەواوی چوو بووە ناو ڕایەڵی تانوپۆی گوڵدانەکەوە بێ ئارامی و نارەحەتی پێوە دیار بوو. هەرسەری دێناو دەبرد و خۆی خوار دەرکردەوە، و دەیویست بە هەرشێوەیەک بووە زیاتر و چاتر گوڵدانە جوان و عەنتیکەکە ببینێ. هەر دەتگوت ئەوە لە تەواوی تەمەنی خۆیدا یەکەم جارە لەگەڵ جوانیدا ڕوو بەڕوو دەبێتەوە و یان ئەوەتا یەکەم جاربەتی هەست بەجوانی دەکا!

چینیەکی جوان بوو. نەخش و نیگارێکی وای لەسەر دەسکە باریکەڵەکانی کێشرابوون و لەگەڵ نەخشەکانی بەدەنەی خوارەوەی گوڵدانەکە لێکیان دابۆوەو وای لێکربوو هەروا بە ئاسانی نەزانی ئەوە دوو دەسکی گوڵدانەکەن. هێندەش ناسک و تەنک بوو کە ئەو تیشکە ڕووناکییەی لە پەنجەرەی پاسەکەوە دەهاتە ژوورێ و لێیدەدا و بەدیواری گوڵدانەکەدا تێدەپەڕی ئەو نەخش و نێگارانەی وا لەسەر دەستکێشی کابرای خاوەنی وە

سەماو جووڵە خستبوون مەپرسە.
پیاوەی قەمسەڵە لەبەر. تەواوی وورده کارییەکانی ڕووی لای خۆی ئەو گوڵدانەی نیگا ئاژن کردو هێشتاش هەر دڵی دانەکەوتبوو. لەگەڵ هەر بادانەوێکی پاسەکەشدا کە خەڵکەکەی بەسەریەکدا دەدان و تێکی هەڵدەشێلان، ئەو ئەگەر بیتوانیبایە ئەو هەلەی لە دەست نەدەداو تۆزێکیش زیاتر بەلای خاوەن گوڵدانەکەدا خۆی لارتر دەکردەوە تا بەڵکە ئێ ئەوە خوایە بتوانێ دیوە نادیارەکەی ئەو دیوی گوڵدانەکە ببینێ. زۆری هەوڵدا بەڵام هەربێسوود بوو دڵی دانەکەوت و ئۆخژنی نەهات. تا دوایە دووسێ جارانی خۆ هێنا و بردو خۆی ئامادە کرد و لە کاتێکدا کە خاوەن گوڵدان پەی بە نائارامی وی بردبوو گوتی: قوربان ببوورە! دەتوانم سەیرێکی ئەو گوڵدانەتان بکەم؟
- بەڵێ ێ ێ! فەرموون. جا ئەوە چیە گیانە!
و گوڵدانەکەی بەرهەدوو دەستان و زۆر بەئەسپاییەوە دایە ئەو چاردا و ڕووەو گوتی:
- بەڵام تکا دەکەم ..
بەڵام ئەو مۆڵەتی نەدا. قسەکەی پێ برێ و گوتی:
- بەچاوان! دڵنیابە - زۆر بەووریاییەوە.
و دەستی کرد بەتێروانینێی لە پێش و لە پاش، لە سەرو لەبن، دەرو ناوی ، چ جێیەکی نەما تەماشای نەکات لە تەواوی ئەو کاتەشدا خاوەن گوڵدان چاوێکی هەر لە دەستی کابرای بوو. هەر چەندە وای خۆ دەردەخست کە گوێ ناداتێ، بەڵام کەسەری نەوی دەکرد لە ژێرەوە خەریکی خوێندنی ((وان یکاد))ێک بوو کە لەسەر پانکەدارێک هەڵکەندراو و بەبەردەمی کابرای شوفێرەوە داکوترا بوو. بەتیلەی چاویش، هەر سەیری جووڵەی دەست وپەنجە و هەڵس و کەوتی کابرای دەکرد. بەڵام کابرا، هەموو جێیەکی گوڵدانەکەی زۆر بەووردی پشکنی. وەبەر شووشەی پەنجەرەی پاسەکەی دا. دەستی بەسەر داهێناو ڕووناکایی وێنە ڕەنگاو ڕەنگەکانی دەوروبەری پەنجەکانی کە لە گوڵدانەکەوە دەهاتن و سێبەری دەستی خۆشی دیت کە ناو گوڵدانەکەی کەمێک تاریکتر کردووە، دیسان بەتەماشا کردنێیدا هاتەوە. بەهێنان و بردنە پێشی گوڵدانەکە لە شووشەی پەنجەرەی پاسەکەوە ئەو تاریک و ڕووناهیەی کەموو زیاد پێدەکرد و ..
لە پێچێکدا کە پاسەکە بایدایەوە، خەڵکەکە پارسەنگی خۆیان بۆ ڕانەگیراو لە پڕ هەموو بەسەریەکدا تەپین، کابراش خوار بۆوە. زۆر خوار بۆوە. چونکە هیچ دەستگیرە و شتێک

نەبوو کە خۆی پێ بگرێتەوە بەلا داهات و بەناچاری دەستی لە قولفی گوڵدانەکە بەردا .. و گوڵدان کەوت و لەگەڵ نەرمە زرینگەیەک بووە سێ پارچە!

هێشتا پاسەکە پێچەکەی تەواو نەکردبوو کە خاوەنی گوڵدانەکە هاواری لێ هەستا: ئاخ . و ئیدی هیچی دیکەی نەگوت و زۆر بەواقێکی وورەوە لە پارچەکان ڕامابوو. پیاوە بێ چاوو ڕووەکەش داهاتەوە و لەکاتێکداکە پارچەکانی گوڵدانەکەی کۆ دەکردنەوە گوتی:

– هیچ نیە چ نەبووە!

پیاوی خاوەن گوڵدان کەتازە هاتبۆوە سەرخۆ لە پڕ وەک تۆپ تەقیەوەو بەڕەنگێکی هەڵبزرکاوەوە گوڕراندی:

– باشە دەتەویست چۆن بێ؟

– هیچ قوربان! باشە، خۆچ نەبووە! گوڵدانەو شکاوە، بەقوربانی خۆتان بێ، بەلاوە گێڕە ئیشاڵلا!

– ئاها! پیاوێکی تەواوی، لووتت بگرن ڕوحت دەردەچێ!

– براڵەگیان ڕێزی خۆت بگری باشە. بۆ قسەی نابەجێ دەکەی؟

– جاتۆ گوێت لە قسەی نابەجێیە، پیاو! ئەگەر نەتدیبایە چاوی بابە قۆرت کوێر دەبوو؟

تازە خەڵکەکە پێیان زانیبوو. یەکێ لە ژنەکانی تەنیشتیانەوە لە ڕووی دڵسۆزییەوە هەڵیدایەو گوتی:

– داخی گرانم! چ گوڵدانێکی جوان بوو! بەخوا حەیف. بەڵام ئەو پیاوەش ڕاست دەکا، قەزاو .. خاوەن گوڵدانەکە بەو جۆرە قسەکەی پێ بڕی:

– ئەوە دەڵێی چی خانم؟ حەفتاو پێنج تمەنم پێداوە!

و پیاوە چەقاوەسووەکە هەڵیدایە: باشە چمان پێدەکرێ؟ بیبەپێکیەوە دەنێنەوە ئیدی .. ژنەی دیکە لەبن پەچەیڕا دەنگی لێ بلند کرد کە:

– باشە براڵە مەگەر دەست و پەنجەکانت کۆڵەوار ببوون؟ و

پیاوە چارداو ڕووەکە، کە لەگەڵ خاوەن گوڵدانە کە چەقەیان بوو و بەبێ ئەوەی ڕووشی تێبکا لاو نیو ئاوای وەڵامی ژنەی دایەوە:

– خانم کەس لە دووی ناردووی، لە هەموو دیزان ئەسکوێ بی.

– وەی وەی! خوایە بەدوورمانکەی! لووتی بگری ڕووحی دەردەچێ، کەچی خەریکە زەلامی بخوا خاوەن گوڵدانەکە تازە قیت ببۆوە دەستکێشەکەی لە دەستی و لە کاتێکدا

که پارچەکانی گوڵدانەکەی بەدەستەوە بوون دەینەڕاند:

- پیاوە تیمان کرد ئێمە میللەتێکین قابیلی هیچ نین. ئێستا کە شکاویشە دەڵێ قەزاو بەلای بردووە بەڵێ پێی وایە وازی لێدێنم! بۆتا دوا ماقرت لێنەستێنم وازت لێدێنم بۆ پارە، کایە؟

من گوڵدانی بکڕم و جەنابیشت بیشکێنی و بشڵێی جاچییە، بیبە پێکیەوە نێنەوە؟ پیاوی چاکی، باشە تۆو شتی عەنتیکەیان گوتووە؟ بای هێندێ نابی هەر تەماشاشی کەی. ئەدی منی گێل بۆ ناڵێی پیاوەتیم لەگەڵ چ لەندەهۆڕێکی کردووە .. و دەودەمەیدا کە پاسەکە دەگەییە وێستگەی ڕاوەستانێ درێژەی دایە:

- کاکە ووریا بە. پولیس لێرە نزیکە. من دەبێ کاری خۆم لەگەڵ ئەو کابرایە یدا یەکسەرەکەمەوە .. لە بارێکدا کە خەریکی هەستانێ بوو، ڕووی لە شوفێرەکە کرد و گوتی:

- نەیەڵی ئەو کابرایە دابەزێ تا دەچم پۆلیسی بۆ دێنم و شایەدی ئەو خەڵکەش وەردەگرم .. و هێشتا نەگەیبوە دەرکی پاسەکەی کە گەڕایەوە. و لە ناوەڕاستی پاسەکەی ڕاوەستاو ڕووی کردە نەفەرەکان، تکایە کەی دووبارە کِردەوە تا دادەبەزێ هەروەها جارێکی دیکەشی گفت لە شوفێرەکە وەرگرتەوە کە نەڕوا. شوفێرەکە گفتی دایە، و ئینجا ئەو دابەزی.

نەفەرەکان لە نێوان خۆیاندا هەر لەو بارەیەوە دەدوان یەک دوو کەس نەبێ هەر تەماشایان دەکرد و پێدەکەنین. ئەو دوو ژنەش هێشتا هەر وورتە وورت و مینگە مینگیان بوو بێ ئەوەی کەس ئاگای لێیان بێ یان گویان بداتێ. کابرای بێ چاو و ڕوو لەبەر خۆیەوە دەدوا:

- باشە چ دەکرێ! خۆمن بە ئانقەست ئەوەم نەکرد. باشە ئیدی کەوت و شکا ..

شاگرد شوفێرەکەش هەرهاواری نەفەرانی بوو و بانگی دەکردن. خاوەن گوڵدانەکە پازدە بیست مەترێک لە پاسەکە وە دوور کەوتبۆوە. کاکی شوفێر کە تاوێک بوو دەبیر و لێکدانەوان ڕاچووبوو تەکانێکی دا، لەسەر کورسییەکەی پشت ستێرنەکەوە خۆی قیت کردەوە، بانگی شاگردەکەی کرد و پێی لێناو وەڕێ کەوت.

هەموو نەفەرەکان لە حەژمەتان زاریان بەش بۆوە. و شاگرد شوفێرەکە کە خەریکی دانیشتنێ بوو لە وەلامی واندا گوتی:

- ئێ باشە بە ئێمە چی؟ یەکێکی دیکە گوڵدانی شکاوەو ئێمە بێکار ڕاوەستین؟

خاوەن گوڵدان کە بە هەڵەداوان بەرەو پۆلیسخانە دەچوو، ئاوڕی دایەوە. گەڕایەوە و بەدەست ڕاوەشاندنەوە دەیویست بێت و پێش بە پاسەکە بگرێ. بەڵام تازە هیچ پاسەکە پێچێکی چکۆڵەی کردەوە و تێپەڕی و ئەو هاواری لێ بلند بو:

– ئەها بیگرن .. بیگرن .. گوڵدانەکە .. شوفێری ڕووڕەش .. ئەهای پۆلیس ..

نەفەرەکان بەو دیمەنەی وی کەوتنە پێکەنینێ.

پۆلیسی لێ خڕبوونەوە، لێیان دەپرسی چ بووە، بەڵام ئەو هەر هاواری بوو:

– ئەها بیگرن .. حەفتاو پێنج تمەن .. ناپیا و .. گوڵدانی چینی .. ئەها ڕۆیی .. باشە ئەدی ژمارەی پاسەکە چەند بوو؟ .. ئای پۆلیس!

---

٢٨ / ٥ / ١٩٩٩

دارەتوو

لەکتێبی / ((دید و بازدید)) جلال ال احمد چاپ چهارم : ١٣٢٦ تهران انتشارات فردوس. چاپخانە رامین:ەوە کراوە بە کوردی

- سواربە.

پیرێژن بە خۆپەلکێش کردنێوە چووە پێشێ و دەستێکی بەدەرگای ئوتومبێلەکە داهێنا و دەستگیرەکەی دیتەوە. هاوین بوو. دەستگیرەی تاین سوور سوور ببۆوە. دەرگاکەی نەکرایەوە. دەنگی پیرێژنێ بەنەرمییەکەوە:

- ناکرێتەوە!

کوڕە بەبەر لووتی ئوتومبێلەکەیدا وەرسووڕایەوە تابچێ لێخوڕێ. بەلای پەنجەرەی دەرکی ئوتومبێلەکەوە گنخا چاوێلکەکەی سەر کەروێشکەی لووتی نەختێک هێنا و برد و ملی درێژ کرد:

- ناکرێتەوە؟ دە ئەو دوگمەی پاڵ پێوەنێ.

پەنجەکانی پیرێژنێ توانایان نەبوو. دیسانەوە دەنگی لێ بڵند بۆوە:

- ناکرێتەوە!

کوڕە شەلالی ئارەقەی بوو. ڕوومەتە گۆشتنەکانی هەروا بریسکەیان بوو. مووی سەری ڕاست ببوونەوە، تووڕە بوو، بەخێرایی هاتە پێشێ، بەگرژی و مرچ و مۆنییەکی لەسەر خۆوە گوتی:

- دەرکی ئوتومبێلێکت پێ ناکرێتەوە؟

پیرێژن هیچی نەگوت. داوێنی عەبا ڕەشەکەی خڕ کردەوەو گران و سەنگین دانیشت.

دوو هەفتە بوو پیرێژن جار جارە تووشی دڵە کوتەی دەبوو.

هەندێ جار تینی بۆ دێنا و تەنگە نەفەسی دەکرد.

- دڵم دەڵێی تۆپی نادر شای تێدا دەتەقێنن!

- چ نیە دایە. ئەوە ڕەنگە شتی قورست خواردبێ!

هەرکە ئوتومبێلەکە وەڕێ کەوت، وورەی بایەکی گەرم و لەسەرخۆ دەناو ئوتومبێلەکەی گەڕا. پیرێژن دەئارەقەیدا هەروا شلەپەی بوو. چاوی بەدادە نەسرەتێ کەوت کە، بەپشتی کووڕەوە دەست بەدیواربەوە لەسەر پیادەڕۆیە ڕاوەستاوە تاتۆزێک بحەسێتەوەو هەناسێکی بێتەوە بەرێ. دادەنەسرەت سەرتاپای ڕەشپۆش بوو. ئوتومبێلەکە لەسەرخۆ تێپەڕی و دادەنەسرەتی لە درێژایی کۆلانە تەنگەبەرە خۆلاویەکەدا بەجێهێشت. پیرێژن سەری وەرسووڕاند و لە شووشە پەنجەرەی دواوەی ئوتومبێلەکەوە دادەنەسرەتی وەک پەڵەیەکی ڕەش دیت، لەبەر تیشکی بەتینی خۆری نیوەڕۆ لەو کۆلانە چۆڵە گەرمەدا، تا دەهات وە دوور دەکەوت.

پیرێژن هەر بۆ خۆی و لەبەر خۆیەوە گوتی: ((ئای دادەنەسرەت ئەگەر دنیا بۆتۆ نەما!)) هەناسەی لە سینەیدا گیر بوو. کە مێردەکەی مرد ڕەنگ و بۆی ماڵەکەش گۆڕا.

- باشە ئەو دایکەی تۆ چی لەمە دەوێ؟

دوای چلەی مێردەکەی بوو، لە مەتبەخێ هەوری دەشووشتن. دەنگی بووکەکەی بوو:

- ئیدی هۆدێکی بۆ بگرە بابڕوا.

- ووس س س س.

دەنگی لەسەرخۆی کوڕەکەی بوو:

- کچێ ژنەکە کەمێ هێواشتر گوێی لێیە!

- ئاخر منیش بە ئانقەست دەنگ هەڵدێنم تاگوێی لێبێ!

بچێتە کوێ؟ کچە گەورەکەی ئەوە چەند ساڵێکە لەسەر منداڵیەوە چووە. ئێستا ئێسکیشی نەماوە. ((دەچم هۆدێکی دەگرم!)) کچە بچووکەکەشی ئەوە لە هەندەرانە لەوسەری دنیایە. ((خۆ لە دادەنەسرەتێ کەمترنیم!)) دوای سێ ڕۆژەی مەرگی مێردەکەی لە ژوورەکەی خۆیان گواستەوە. کە لەناوەڕاستی حەوشێ لە پەنا کۆختەی مریشکان لە ((ژووری مانگا)) یەکێدا دەژیا. کەمێردەکەی مرد، هەر خێرا حەوشەکەیان کاشی ڕێژکرد و مانگالەیان فرۆشت و پەلەوەرەکانی دییان هەموو سەربڕین.

- کە یەخچاڵ هەبێ و شیری ووشکیش بەپای پیلان بێ، ئەوا هێلکەش لە لای بەقاڵان فرت و فراوانە ..

پیرێژن لە توانایدا نەما. وەقسە هات:

- باشە بۆ هەشت یەکەکەی خۆمم نادەنێ؟

کوڕەکەی بێ ئەوەی ڕووی وەرسوڕێنێ وەقسەهات:

- دەیدەم دایە، دەیدەم! هەروا تۆزێک ڕاوەستە.

- تەمەنی درێژ شەرمی لە کەس نەکردووە!

قسەی دایکەکە ناخۆش بوو، کوڕە تێی گەیی. ددانی بەخۆیدا گرت. تفی ناوزاری قووت دایەوەو لە سەرخۆ گوتی:

- دەتۆ جارێ وەرە، پەنجەی پێوەنێ!

ئوتومبێلەکە بەلای شەقامی پەهلەویدا بایدایەوە. کوڕە تاقەکانی سەر پیادە ڕۆیەکەی تەماشاکردن. خەیاڵی وابوو کە کاروانسەرای کاوە تێک بداو لە نوێ دروستی کاتەوە.

ئەوەشی بەبیــرداهات کــە لەبەردەم هەرهۆدەیەکی نوێ داتاقــێکی بە (خــشــتی سی سانتیمەتری) لێدا. نێوچەوانی ئارەقەی کردبوو.

((گەرمای ئەم خوارە سێبەرە چەتری دەوێ تاق نوما. نەک پەنجەرەی تاکو توک فەردیوو شوشەدار)).

پیرێژن خەیاڵی چۆوە لای مەزارە دڵ گیرەکەی دانیالی مێردی سەیرێکی تاق و سێبەری سەرهۆدە تاریک و دەرگا نزمەکان و پەنجەرە تەسک و تروسک و بچکۆلەکانی کرد. ((لە پەناتم)) دەنگی مــێــردەکــەی هاتە گــوێ. دەنگەکــە گــران بوو((ســڵاو ئەی دانیــال پێغەمبەر)).

سەیرێکی ئەم لاو لای کرد. خۆرەتاو لە شووشەی پەنجەرەی ئوتومبێلەکەوە هاتبوە ژووری و دەتگوت:

- ئەوا لەبەرگی کـوشـینی ئوتومـبێلەکـەوە دووکـەڵ هەڵدەسـتێ. هەناسێکی قـووڵی هەڵکێشا. سەیرێکی پشتەملە درێژەکەی کوڕەکەی کرد. شەلاڵی ئارەقە بوو.

- باشە خۆتۆ نەتگوت کە ..

- کەچی دایە؟

- نەتگوت ئەو پەنجە مۆرد بۆ چیە؟

کوڕە ڕووی وەرسوڕاند. چاوەلێلەکانی لەودیو شووشەی چاوێلکە ئەستورەکەیەوە گەورە و گەش دیاربوون.

- دایە پێم گوتی. تێگیـراویم هەیە، دەبێ دەهانام بێی ببـیـە کەفـیلم! کەفـیلی ئاسکە کێوی. خۆراوای تەنیـایی. پیرێژن هەناسێکی هەڵکێشاو لەبەر خۆیەوە گوتی: ((کەفیلی ئاسکە کێوی!)) دڵی گوشرا. هەفتەی پێشوو ڕۆژی هەینی ویستی هێندێک گەمان لەگەڵ مـازیار دا بکات، پێی خـۆش بوو نەوەکـەی لەبەر و باوەشی خـۆی بگرێ و دەسـتـێکی بەسـەریدابێنێ، بەڵام کە دەسـتی درێژ کـرد وەک دووپشـکەی بەدەسـتیـەوە دابێ، دەسـتی کێشایەوە.

- دەتێیـگەیەنە. بابزانێ کەنابێ بەو دەستانەی هەزار و یەک پیسی و پەڵۆخیان پێوەیە دەست بەسەری کچەکەم دابێنێ! پیرێژن تەماشایەکی دەستەکانی خۆی کرد، پاکو خاوێن و سپی و سۆڵ بۆنی سابوونی بۆنداریان لێدەهات.

- کەفیل بۆچی؟

- زۆر دەپرسی دایە؟

لە ژووری نوسینگەدا، سەردەفتەر لە بارەی مێردی پیرێژنێوە دووا:
- ڕەحمەتی خوای لێبێ!
سەر دەفتەری پیرسەری بڵند کرد و ڕوانی. پەنجەی پیرێژنێی گرت:
- لە پیاوە قەدیمیەکان بوو!
پەنجەی پیرێژنێی مۆرمۆرکرد.
- لەو پیاوانەی کە دوای خۆیان کەس جێیان پڕناکاتەوە.
پیرێژن پەنجە مۆری بەسەنەدەکەوەنا. بەشە خانووەکانی شەقامی سەعدی، و بەشە ژوور و خانووە نوێیەکانیشی هەموو پێ مۆرکرد. دەفتەر نوسی پیر وورتەی لێنەهات. جگەرەی دەنێو پەنجکانیدا ببووە خۆڵەمێش. سەر دەفتەر نەرمەی لوتی خوراند.
- ئێرە، دایکە، بێ زەحمەت ئێرەش پەنجە مۆرکە. پەنجەی پێوەنا. کاروانسەرای شەقامی کاوەشی هەرخستەسەر. کوڕە هەناسێکی قووڵی هەڵکێشا و جگەرەیەکی دایساند. جگەرێکیشی بۆ سەر دەفتەری پیر ڕاداشت. پیرێژن بەخۆ و بە پەنجەی مۆرەوە بەتێماوی ڕاوەستابوو. دەفتەر نووسی پیر لە جێی خۆی هەستا.
- وەرە خوشکێ. وەرە بەو کاغەزەی قامکت بسڕەوە.
هاتنەوە ماڵێ بووکە بەبرۆیان ئامـاژەی کـرد، کـوڕە بەچاوان و بەزەردەخەنەوە وەڵامی ئاماژەی ژنەکەی دایەوە. بووکە گەشایەوەو کەوتە زەردەخەنە. پیرێژن هەموو ئاماژەکانی دیتن، زەردەخەنەی بووکەکەشی هەردیت، بەڵام بەسەرخۆی نەهێنا، چۆوە ژووری مانگاکە، عەبایەکەی فرێدایە ژوورێ، گەڕایەوە و چوو لەبەر شێرەی ئاوێ دانیشت تا پەڕۆ پاتاڵەکانی مەهنۆشی نەوەی بشوات.
لە مردنی مێردەکەی دادەنەسرەت هاتبووە لای بۆ سەرەخۆشییە.
- زۆر بەخێرایی دادەنەسرەت. فەرموو بۆ لای سەرەوە. قلیانێکی بۆ دادەنەسرەتێ دا دەیسێنێ و دوایی گوێ بۆ قسەکانی هەڵدەخا.
- پیری و تەنیایی و نەبوونی زۆر تاڵن، دادە - بەڵام دڵم ئاسودەیە! ئەویش دوایی دەچێتەوە سەردانی دادەنەسرەت.
- دادە، لێرە یانی، هەروا بۆ نموونە ..
چاوی بەتەواوی ئەو حەوشە دێر و هەرشەمەی حاجی بەندەریدا دەگێڕێ.
- هۆدێکی بەتاڵ وە دەست دەکەوێ؟
- بۆ خۆت؟

دەنگی مێردەکەی هاتە گوێ. بەکەیف بوو ((کوڕی کەس نابێتە کوڕی کەس)) ئەوە هەر ڕاست دەنگی خۆی بوو هەمان دەنگی زیندوو و زەنگۆڵەداری خۆی کە لە ڕابوردوویەکی دوورەوە دەهات:

((کە ئەم کوڕە گۆچانی دەستی منە. گۆچانی پیری!)).

دەنگی بووکەی لە ژورێرا هات:

- تێماوم کە ئێوەی چۆن گەورە کردووە، ئەدی ئەوە نیە پارچە پەڕۆیەکی منداڵەکەمی بە تەواوی پێ ناشۆرێ!

پیرێژن گوێی لێبوو. هیچی نەگوت. نیوەڕۆ بوو، گەرما، دەنگی بانگی لە مزگەوتی صاحب الزمانەوە ڕاهات. پەڕۆپاتاڵەکانی بەنیوە شۆراوی بەجێهێشتن و هەستا. دەنگی مێردەکەی بیستەوە: ((خێری نوێژێ ئەوەیە لە کاتی خۆیدا بکرێ)) دوای مردنی مێردەکەشی وەک هەمیشە دەنگەکەی چاکتر ببیستێ. دەستی لە ئاوێ دەرێنادەنگی بانگەکەی وە دوور کەوتەوە.

- حی علی الصلاه.

دەستنوێژی هەڵگرت و چۆوە ژوری مانگایەکەی. با، دەنگی بانگەکەی هێنایەوە.

- حی علی خیر العمل.

کە نوێژەکەی تەواو کرد، گەرێکی تەزبیحەکەی بادا و گوتی:

((خێری زیکری دوای نوێژ)) دەنگی مێردەکەی بوو. ڕووی سووڕاند کەس نەبوو. دیتی ئەوە نانی نیوەڕۆی لە بەردەرکی هۆدەکەیە. هەستاو وبە لۆژە لۆژ چووە ئەوسەری حەوشێ، دەرکی خانوویی کردەوەو چووە ژووری بایەکی فێنکی کۆلێرەکەی لە لەشی ئارەقاوی دا. ترسا باپەڕبێ. لایەکی چارۆگەکەی ڕاکێشایە سەرسنگی. هێشتا سفرەی نانخواردنێ هەڵنەگیرابوو. بووکە بەسەر سوڕمانەوە دەپیرێژنیی ڕوانی و هیچی نەگوت. مازیار و مەهنۆش لەبەر کۆلێرەکە نووستبوون. پیرێژن وورده وورده و لەسەرخۆ چی لە دڵیدا بوو گوتنی:

- دەمەوێ هۆدێکی بەکرێ بگرم.

کوڕە بەدەمێکی نیوە بەشەوە دەژنەکەی خۆی هەڵڕوانی، دوایی سەری بەلای دایکیدا وەرگێڕا و چاوێلکەکەی سەرکەرویشکەی لووتی هێناو برد و نەرم و لەسەرخۆ گوتی:

- بۆ دایە؟

پیرێژن هیچی نەگوت. تەنیا هەر تێیراما.

- بۆ خوانە خواستە لێمان بێزار بوو وی؟
کوڕە دیتی کە پیرێژن متتەقی لێنایە، دیتی بیلبیلەی چاوەکانی پیرێژنێ وەک تەمێکی خۆلەمێشییان لە سەر نیشتبێ.
- دیارە دیسان هەشت یەکەکەت دەوێ.
بووکەکەی گوتی:
- ئەدی ئەوە نیە ئوتومبێلمان بۆ کڕیوی؟
پیرێژن تێکڕابوو. سوورِ هەڵگەڕا. پێکەنین لە چاوی بووکەکەی دەباری.
- ئەوەی لە گەڕاجیدایە!
دەنگی پیرێژنێ زۆر بە زەحمەت بیسترا.
- بۆ من ..
بووکە گوتی:
- هەموو پێنج شەموو و جومعان سوار دەبی و پێی دەچیە سەرقەبران ..
کوڕە سەیرێکی ژنەکەی کرد. ژنە قسەکەی خۆی قوت دایەوە. پیرێژن هەناسێکی هەڵکێشا .. (( بوومەتە قەشمەرجاڕی منداڵان دادە.
قەشمەرجاڕی نەوە و نەتیجان)) ئەوە دەنگی دادەنەسرەت بوو.
- کوڕە وە قسەهات:
- ئێستا، لە هیچ ناقایلی، دایە؟
دایکە هیچی نەگوت. کوڕە جگەرەیەکی داگیرساند و لەسەرخۆ گووتی:
- هەمیشە لە خزمەتتدام، بۆ هەرجێیەکی بڵێی، دایە!
پیرێژن ڕووی وەرگێڕا و نەرمە نەرمە چۆوە ژووری مانگایەکەی. قاپ و سینیەکەی هاویشتنەوە ئەودیوی دەرکەی و هەردوولای دەرکەکەی پێوەدان و ئاڵقەورێزەکەی داخست.
- دەڵێی تۆپی نادرشام دەدڵێدا دەتەقێنێ!
پەتوودەکەی لەسەر قاڵیەکە ڕاخست و دانیشت. لێوەکانی جووڵان. بەرەو قیبلە ڕاکشا. چاوەکانی لێک نان و لێوەکانی لە جووڵە کەوتن و ئارامیان گرت.

---

لەکتێبی/ قصە و اشنا. نویسندە: احمد محمود مووسسە انتشارات نگا: چاپ سوم: ١٣٧٧، چاپخانە: میشارق فرازانگان-ەوە کراوەتە کوردی ١ / ٦ / ١٩٩٩ دارەتوو

مام ڕێویەکم دراوسێیە، کە دڵی بە ئەندازەی هەموو هەورەکانی وەرزی زستانێ گیراوو توندە. چەند مانگێک دەبێ تا ئێستا زەردەخەنەی نەهاتۆتە سەر ئەو دەم و قەپۆزە باریکەڵەی.

هەر چەندە منیش لەوی چاترنیم، بەڵام جار جارێک ئەگەر بەگاڵتەشەوە بووبێ زەردەیەکم هەر هاتۆتە سەرلێوان و پێکەنیوم. ئیدی هەرواشە.

مرۆڤ دراوسێیەکەی خۆی ئاوا بەغەمبارییەوە ببینێ هەروا دەبێ.

ئەوڕۆی بەیانییەکی وەرزی زستانێ کە هێشتا خۆر لە ڕۆژهەڵاتێوە سەری لەکەل دەرنەهێنابوو و بەفر و باران و ڕەهێڵە هەموو جێیەکیان داگرتبوو. مام ڕێوی مرچ و مۆن، لە کونەکەی هاتە دەرێ و غارەغار بەچاوی فرمێسکاوییەوە دەم و قەپۆزە باریکەڵەکەی لە پەنجەرەی سەردیوی دەرێی ژوورەکەمەوە هێنایە ژووری و گوتی:

((مام گورگ! گوێ بگرە تا دوایین شیعرێکی کە نووسیوومە بۆت وە خوێنم)).

گوێم ڕاداشتێ تا مام ڕێوی مرچ و مۆن بەدەنگە گیراوە پڕ هەنیسکەکەیەوە دوایین شیعرەکەی خوێندەوە:

((ئای کە لە قووقە قووق و نەستاندنەوەی بانگ و خوێندنی ئەو هەموو کەڵەبابانە دڵتەنگم!))

---

لە کتێبی/ باغ اناری، محمدی شریفی مجموعە داستان چاپ اول: ١٣٧١- نشر گردون ەوە کراوە بە کوردی -١٨ / ٦ / ١٩٩٩ دارەتوو

پوورمەرجان گوتی: ((ئەو بەستەزمانە بێچارە، شێت بووە!))
مـەمـەدۆ هەر خـەریکی چاوپێکدادانێ بوو، هەڵیـدێنان و دەینوقـاندنەوە، گـوتی: ((یەکەمجار ئەستێرەیەک بوو)).
پوورمەرجان دەرکی تەویلێی داخست. بەشەلەشەل بەرەو لای کۆختەی مریشکانەوە چوو کـە لەبن دارە وشکەڵەکـەی نێـوە ڕاسـتی حـەوشێ بوو گـوتی: ((پت پت پت! پت پت پت!)) مـریشکەکـان هەمـوو چوونەوە دەکـۆختـەکـەی، پوور مـەرجـان دەرکی کـۆختـێـشی داخست. مەمە دۆ چاوی پێکدادانەوە. بەدرەختە وشکەڵەکەی نێو حەوشێدا هەڵگەڕا، گـوتی: ((دوایە بوونە دوو ئەسـتـێرە)) درەخـتـە ووشکەڵاتووەکـە لەبن پێی مـەمـەدۆی وە زاڵە هاتبوو. پوور مەرجان بەشەلەشەل بەرەو سێدەریە ملی لێنا، گوتی:
((بەستە زمانی بێچارە!))
مەمەدۆ بەلقێکی درەختەکەوە بوو و بە هەواوە هەڵواسرا، گوتی:
((دوایی دەدانە))
پوور مەرجان بەشەلەشەل بەرەو تەویلێ چۆوە، لەسەر لێوی دیوارە نزمەکەیەوە سەرێکی خوار کردەوە: ((شێت بووە!)) مەمـەدۆ کە هەروا بەهەواوە هەڵواسرابوو، گوتی! ((دوایی سەد دانە)).
پوور مەرجان بەشەلەشەل بەرەو لای مەمەدیەوە چوو، گوتی:
((مەمەدۆ! ئەرێ مانگا لە شێت دەبن؟))
مەمەدۆ کە هەروا بەهەواوە بوو، گوتی: ((دوایەش بوونە چەند؟))
خـۆر، چوو بـووە کـێـوان. پوور مـەرجـان لە پەنا ووشکەڵەدارەکـەی حـەوشێ دانیـشت دانیـشت و کـەوتە هەنیـسکان دەنگی گـریانی مـانگالەی دەهەوایدا بڵاو بۆوە. دەنگی گریانی پوور مەرجانێش تێکەڵاوی دەنگی گریانی مانگالەکێ بوو. مەمەدۆ هەر بەهەواوە دەهات و دەچوو. لە پڕ لادەرکەتەختەکەی حەوشێ کرایەوە. ئامەندلی بەخۆو بە عـەرەبانە تریشـقـەکەیەوە هاتە ژوورێ. پوورمـەرجـان بەلایەکی چارۆگە ڕەشـەکەی فـرمێـسکەکـانی چاوی سڕینەوە. هەستا و بەشـەلەشـەل بەرەو تـەویلێوە چوو. ئامـەندلی بەعـەرەبانەوە بەرەو لای پوور مەرجانێوە هات، گوتی: ((ئیدی پوور مەرجان، ئەوە دنیایە کەیە!)).
مەمـەدۆ کە هەروا بە هەواوە بوو گوتی: ((هەزار دانە. ئاسمان پڕبوو لە ئەستێرە، بەڵام بەچ دەچێ؟ شەویش بووە ڕۆژ. ئیدی خۆ تاریک دانایە تا ..)).
دەنگی گرمـە گرمی بەرمیلێکی ئەو کۆڵانانەی هەمـوو داگرتبوو. پوور مـەرجان دەرکی

تەویلێی کردەوە مەمەد بەربۆوە خوارێ. وشکەدار بەهەناسە بڕکێوە کەوتە سەما. ئامەندلی کلکی گوێلکەکەی گرت خشەخش لەتویلەیڕا هێنایە حەوشێ. پوورمەرجان دەرکی تەویلەکەی داخستەوە مەمەد دەحەوشێدا کەوتە ڕمبازییان. گوتی: ((مرد مرد! چ زۆرە گوێلک زۆرە؟)).

لە پڕمەی گریانێیدا. بەرەو دەرکی دەرێ هەڵات و وونبوو. ئامەندلی **گوێلکە مردارەکەی** دە عەرەبانەکەی هاویشت و، لە دەرکی حەوشێ چووە دەرێ. پوور مەرجان **لە پلیکانەکانی** سێدەریەڕا وەسەرکەوت، لامپای پێکرد و چووە ژوورێکی سێدەرییە. **دەنگی گرمەی** بەرمیلەکە دەشەوێدا بەهەموو لایەکیدا بڵاوبۆوە. مانگایەکە سەری خۆی لە دەرکی تەویلەی دا. بۆ ڕاندی، دوایی سەری خۆی لە دیواری دا. دیسان لە دەرکی تەویلێی دایەوە. ئینجا دەستی بەگریان و خولدانی نێو ژووری تەویلەی کرد. ژووری تەویلەی تاریک بوو. مانگایەکە خۆی لە جێی گوێلکەکەی وەردەدا و خۆی تێهەڵدەسووی. مریشکەکان دەکۆختەیدا کردیانە قیقەقیق و گارەگار. مانگایەکە ڕاست بۆوەو تاتوانی سەری خۆی لە دەرکی تەویلێ کوتایەوە. دەنگی هارەهاڕی بەرمیلێ وە دوور کەوتبۆوە. کرمە گوڵە ستێرێک خەریکی گەڕانێ بوو بەحەوشێدا. بایەکی لەسەرخۆ لەگەڵ دارە وشکەڵەیدا خەریکی ڕاز و نیازان بوو. مانگایەکە ئەو جارەیان هەستا و وورده وورده بۆ دوایە کشیەوە، تاگوڕی بەستەوە و لە ناکاو هێرشی کردە سەر دەرکی تەویلەکێ و دەرکەی لە ڕێسمە برد و شکاندی مانگایە هاتە دەرێ. ڕووی دە درەختە ووشکەڵاتووەکە کرد. سەری هەڵێناو چاوێکی بەئەستێرەکانی ئاسمانێدا خشاندو. لە کرمی گوڵە ئەستێرە پڕشنگدارەکەی سەر زەوییەکە وورد بۆوە. دوایی بە زمانی مانگایان یەک بەخۆی بۆ ڕاندی:

((ڕێ تاریکە .. چاوەکانم نابینن .. مەگەر گوڵەستێرێکی پڕشنگدار!))

دوایە لە حەوشێ دەرپەڕییە دەرێ و ئەو وونبوونەی ونبوو، هەرونبوو.

---

لە کتێبی/ باغ اناری، محمدی شریفی مجموعە داستان چاپ اول: ١٣٧١ نشر گردون دوە کراوە بە کوردی - ١٨ / ٦ / ١٩٩٩ دارەتوو

((سەکینۆ! .. سەکینۆ!))
((پلە قەمەر کێت دەوێ؟))
((سەکینۆ.))
((چیشت پێیەتی؟))
((دەمەوێ بەمێردی دەم، جانەوەرە هەڵاتووە.))
((کێ دەیەوێ بیهێنێ؟))
((پیاوێکە لە باقراوارە هاتۆتە خوازبێنییەی.))
((ئەو پیاوەی هەموو دەمێ زەنگوڵەی کەرەکانی قۆڕەیان دێ؟))
((ئەدی، بۆیەیانی زنگوڵە وێدەخا تا ون نەبن.))
((سەکینۆ ئەوی ناوێ؟))
((نا، جانەوەرە دەڵێ مێردی ناکەم.))
((جا بۆ نایەوێ مێردی بکا؟))
((چووزانم، دەترسێ.))
((لە پیاوان دەترسێ؟))
((هۆی، سەکینۆ! .. سەکینۆ!))
((باشە ئێستا هەڵاتووە، چۆتە کوێ؟))
((نازانم بۆ کوێ هەڵاتووە و چۆتە کوێ.))
پلە قەمەر گەیبە دارگەزە چڕ و تێکقڕاوە تەنومەندەکەی مەیدانی گوندی هاواری کرد:
((سەکینۆ .. سەکینۆ!))
کەس نەبوو، گوتی: ((غلۆسین وەرە با ناو ئەو دار و بارانە بگەڕێین بەڵکە ئێ ئەوە خوایە ئەوجانەوەرە خۆی تێدا شاردبێتەوە.))
غلۆسین گوتی: ((پلە قەمەر ناوێرم، دەترسێم.))
((لەچ دەترسێی؟!))
((دەترسم ماری تێدابێ و پێمەوەدا))
((ماری کوێ، زۆر چاکە بۆ خۆم دەگەڕێم. وەرە پیاوێک بی و هێندە ترسنۆک بی!))
((پلە قەمەر من ترسنۆک نیم، بەس دەترسێم مارم پێوەدا.))

هەموو ئەو ناودارانە گەڕا. چەند قوتووە توتنێکی کۆنی لێکەوتبوون. تەقەو ڕەقەی قوتووان بەهەوای وەربوو.

نیوەڕۆ بوو کەس لەوناوە نەبوو. هەور و هەڵا بوو هائێستا هاتاوێکی دی بباریێ. گوتی: ((دیارنیە!)) غلۆسین گوتی: ((من لە پێشداش دەمزانی سەکینۆ دێرەدانیە.))

((چۆنت دەزانی؟))

((بەودیڕا کە درەختەکان نەدەجوڵانەوە.))

ژنێ حەسەن شوانی خەریک بوو لەولاڕا دەهات. کۆڵەکایەکی هاویشتبووە بان سەری، گوتی: ((پلە قەمەر ئەوە لە چ دەگەڕێی؟))

غلۆسین گوتی: ((ئەوە خەریکە لە سەکینۆی دەگەڕێ.))

ژنێ حەسەن شوانی گوتی: ((جابۆ سەکینۆ ونبووە؟))

پلە قەمەر دەستی دەکەلەکێ ناو ڕاستبۆوە، گوتی: ((نە، هاوسێ. ئەو جانەوەرە هەڵاتووە.))

((جا بۆ هەڵاتووە؟))

غلۆسین گوتی: ((پلە قەمەر دەیەوێ بەمێردی دا، ئەویش ترساوە و هەڵاتووە.

ژنێ حەسەن شوانی گوتی: ((گوناهە!))

پلە قەمەر گوتی: ((کەبەرێیەدا دەهاتی لە چ جێیانت نەدیت؟))

((نە، هاوسێ تەنانەت مێروێکیشم لەرێیە نەدیوە.))

پلە قەمەر ملی لێنا، بەرەو لای کۆڵانێ سەرداری بایدایەوە. ژنێ حەسەن شوانی قولاندی: ((باشە کێی هاتۆتە خوازبێنییە؟))

پلە قەمەر گوتی: ((پیاوێکی باقراوایە.))

((ئیشی چیە؟))

((وڵا غدارە، هاوسێ.))

غلۆسین وە دووی پلە قەمەرێ کەوت. کۆڵانێ سەرداری پڕبوو لە ووشکە گەڵای خەزەڵێ. دار پستەکان پایزی لێدابوون و گەڵایان پێوە نەمابوو، ڕوت و قووت ئەو بەرەوبەر بە دیواری ئەو کۆڵانەیدا بەددم شنە بای پایزێوە دەهاتن و دەچوون. پلە قەمەر گوتی: ((پێی وایە منیش بەخۆشی خۆمم شوو کردووە.))

((کێ؟.))
((سەکینۆ.))
((پێی وایە چی؟))
((هیچ غلۆسینۆ، ئەتۆش سەرت کردوو ومە سەرێ؟))
((نەبەقورئان پلەقەمەر. مەبەستم گاڵتەپێکردن نیە.))
((بابی بیر هەڵکەن بوو.))
((بابی کێ؟))
((بابی سەکینۆی، حەوت منداڵم مردوون تا ..))
((هەر حەوتیان مردن؟!))
((بەڵێ، ئەو ساڵانە زۆر نەهاتی بوون. منداڵەکانم یەک بە دوای یەکدا گەورە دەکردن، شەوێ دەنووستین، سبەینێ کە هەڵدەستاین دەمدی دەجێیدا مردوون. تا بەتەنێ سەکینۆم بۆمایەوە. سەکینۆش هێشتا شەش مانگەی تەواو نەکردبوو، ئێوارە وەختە بوو شامێ غەریبان هەواڵیان هێنا بابی کەوتۆتە نێو بیرێ و مردووە..)) با، لایەکی چارۆگەکەی پلە قەمەری دێناو دەبرد. هەور و هەلابوو. بەلام تاهێشتا داینەدابوو. پلە قەمەر بەگەرووی پڕ لە هەنیسکەوە قیژاندی: ((سەکینۆ! .. سەکینۆ!))
گەیبوونە ئەو سەری کۆڵانێ سەرداری. تا چاوبڕکا خەزەڵ بوو و داربستەکانیش رووت و قوت بەدەم باوە دەهاتن و دەچوون. غلۆسین گوتی: ((پلە قەمەر کێ بەو پیاوەکەی گوتووە ئێوە سەکینۆ تان هەیە؟))
((نازانم، هەر کەسێ بووە، ئیدی خۆ ئەو پیاوە بەستەزمانە چ گوناهێکی نیە، ئەو لە ژنێ دەگەڕێ. خواکاری ڕاست بێنێ کەوە دوو پەیسەری سەکینۆی کەوتووە.))
((ئێستا ئەو پیاوە لە کوێیە؟)) ((لەبەر دەرکێ ماڵێ کوێخایە. گوتم: تۆ لێرە ڕاوەستە بامن بچم بیدۆزمەوە و بیهێنمەوە و بیبەینە باقراوایەو هەر لەوێش مارەی کەین. بەڵکە نێ ئەوە خوایە ئێمەش هەناسێکی بدەین و وەحەسێین..))
((هێشتاش دەنگی زەنگوڵەی کەرەکانی هەردێن.))
((نا، کەرەکان خەریکی کاخواردنێن، نارۆن، ڕاوەستاون. کەبەڕێیەدا برۆن زەنگوڵەی لێدەدەن. تۆش غلۆسین سەرت کردوومە سەرێ؟!))

((نا پلە قەمەر، بە قورئان مەبەستم گاڵتە کردن نیە.))

خشەخش بەنێو دار پستەکاندا تێپەڕین. پلە قەمەر لە ماندووەتیان هەناسەبڕکێ ببوو و هەروا خیسەخیسی لە سینگیەوە دەهات گوتی: ((خودایە ئەگەر منداڵی دەدەیە خەڵکی، منداڵی نەگریسی نەدەیەی خوایە!))

غلۆسین گوتی: پلەقەمەر! ئێستا پێت وایە سەکینۆ چووبێتە کوێ؟))

((چووزانم، ئەگەر بمزانیبایە لێی نەدەگەڕام.))

((ڕەنگە چوبێتە ئاودەستی ئەوسەری مەیدانێ و لەوێی خۆشاردبێتەوە!))

((نا، سەرم دەوێش هەڵکردووە، لەوێش نەبوو.))

دیسان هاواری کردەوە: ((سەکینۆ! .. سەکینۆ!))

غلۆسینیش هەر هاواری کرد: ((سەکینۆ! .. سەکینۆ! .. ))

پلە قەمەر بە کوورە کوورِ دەڕۆیی و غلۆسینیشی بەدواوە ڕێویەک بەقەترەسە بەنێو دارپستە ڕووتەکاندا دەبەزی.

هەڵوێستەکی کرد. لە دوور ڕا تەماشەیەکی کردن و بەکلک بادانێوە هەڵات و لە چاوان ونبوو. لە ناکاو هەورە تریشقەیەک بریسکەی لێ هەستا. پلەقەمەر گوتی: ((ئای قوڕم بەسەری! جا ئەگەر ئێستا دایکا ئیدی لە کوێی وەبینم؟))

غلۆسین گوتی: پلە قەمەر مەترسە ناباریێ.))

((دیارە کەرامەتداری غلۆسینۆ، ئەوەنیە هەورگرم و هوڕیەتی!))

((من دەزانم خوا ڕایدەگرێ و نایەڵێ بباریێ!))

زەردە زیڕەیەک بەسەر لکە دارێکەوە دەیخوێند. دەنگی دەهات و بۆ خۆشی دیار نەبوو. خشەخشی خەزەڵێیان لەبن پێیانەوە دەهات. پلە قەمەر گوتی: ((دەڵێم بچینە سەر قەبران، بزانین لەوێ نیە!؟))

((لەوێ دەترسێ!))

((نا، سەکینۆ زۆر ئازایە. زۆر جاران بەتەنێ دەچێتە سەرگۆڕی بابی و لەوێ لەسەری دەگریە.))

((دەنا من ناوێرم بچمە سەرگۆڕی بابم و بگریەم.))

((ترسی ناوێ، هەر کاتێ، کاتت بوو بچۆرە سەرگۆڕی بابت. چاوی لەڕێتە.))

غلۆسین گوتی: ((هات چی گوت؟))
پلە قەمەر گوتی: ((کێ؟))
((پیاوەکە.))
((هیچ لە ماڵێ دانیشتبووم خەریکی موو ڕستنێ بووم، دیتم دەنگی زەنگێک هات، دوایە دیتم ئەوا یەکێک خەریکە لە دەرکێ دەدا، گوتم: کێ یە؟ گوتی: دەرکێ بکەوە! چووم دەرکەم کردەوە. گوتی: ئێرە ماڵێ پلەقەمەرێیە؟ گوتم: ئێوە کێن؟ گوتی: هاتوومە خوازبێنیە. گوتم: بۆ سەکینۆی؟ گوتی: ئا، گوتم: سەرەوخێرە و خێری پێوەیە. لە پرسەکینۆم دیت بەسەر دیواری هەڵگەڕاو بازیدایە ئەو دیوی و هەڵات و ونبوو)) دووبارە هەورو هەڵا وە دەنگ هاتنەوە. لە نێو دارپستە ڕووتەڵەکان چوونە دەرێ. لە ناو گۆڕستانێ درەختێکی زلەی کۆنە ساڵی ئەستوور هەروا هاش و هۆشی بوو بەدەم باوە و قەلە ڕەشەشی لەسەر دەهاتن و دەچوون و چەرخیان دەدا.
پلە قەمەر گوتی: ((غلۆسین من دەنگم نووساوە، ئەتۆ بانگ کە!))
غلۆسین هاواری کرد: ((سەکینۆ .. سەکینۆ!))
پلە قەمەر گوتی: ((بچۆ بزانە خۆی لە پشت ئەو دارەی نەناوە؟))
غلۆسین بەرەو لای پیرە دارێوەچوو. لە پڕ سەکینۆی لەو دیویەوە دیت، چارۆگەکەی دەخۆوە پێچاوە و هەموو نازای بەدەنی وەک مێژۆکێ دەلەرزێ.
گوتی: ((کچێ سەکینۆ! خۆ جێ نەما لێت نەگەڕێین!))
سەکینە بەدەم کوڵی گریانێوە گوتی: ((من نامەوێ مێرد بەو پیاوەی بکەم.))
غلۆسین گوتی: ((ئێ باشە، دەهەستە بچینەوە!))
بەدەم گریانێوە هەستا. بەرەو لای پلە قەمەرێوە چوون. پلە قەمەر هاواری کرد: ((ئەی خوا مەرگ!))
سەکینە بەدەم گریانێوە گوتی: ((نامەوێ مێردی بکەم.))
پلە قەمەر گوتی: ((جا بۆ بەدەست خۆتە، مێردی ناکەی!؟))
دوایە گوتی: ((دەی وەرە دەی فاتیحایەکی بخوێنەو خێرا بڕۆین. غلۆسینۆ تۆش هەر وەرە!))
دیسانەوە گوتی: ((غلۆسینۆ بۆ بابیشت و بۆ حەسەن شوانیش فاتیحایەکی بخوێنە خێرە!))

غلۆسین گوتی: ((جا بۆ دەزانم فاتیحای بخوێنم.))
سەکینە هەر دەگریا. غلۆسین گوتی: ((سەکینۆ! ئەگەر بوویە ژنێ ئەو پیاوەی زەنگوڵەیەکم دەدەیەی؟))
سەکینە گوتی: ((زەنگوڵەی چی؟))
((بۆ خۆم دیتمن سێ زەنگوڵەی بەکەرەکانەوە کردبوو، یەکێکیان لێکەوە وبیدە بەمن.))
((زەنگوڵە سەری خوات!))
((تو قورئان ئەگەر یەکیان لێ نەکەیتەوە و نەیدەی بەمن!))
((نایدات.))
((پێی بڵێ ئەگەر زەنگوڵەیەکی نەدەیە غلۆسینۆی ئەمنیش مێردت پێناکەم.))
پلە قەمەر دەستی سەکینۆی گرت و بەڕێیەدا بەدواخۆیدا ڕاکێشا. غلۆسین بەغار وە دوایان کەوتبوو. دووبارە هەور گرماندییەوە. قەلەڕەشەکان هەروا بەسەر درەختە ڕزیوە کۆنە ساڵەکەوە دەهاتن و دەچوون و قارە قاریان بوو.
پلە قەمەر گوتی: ((پێ هەڵێنن تا نەباریوە دەنا بباریێ تەڕدەبین.)) سەکینە هەر هەنیسکی دەدان. دووبارە هاتنەوە کۆڵانەی سەرداری. ژنی عەلی دەشتی کۆڵەگەلایەکی ووشکی بەسەر تەوقەسەریەوە بەکۆڵانێدا دەڕۆیی، گوتی: ((ئەوە لە کوێ بووی پلە قەمەر؟))
((لەسەر قەبران.))
((نەدەکرا فاتیحایەکت بۆ عەلی دەشتیم خوێندبایە.))
((بۆ هەمووانم خوێند.))
ژنێ عەلی دەشتی هەروا بەخشەخشەوە ڕابورد. گوتی: ((خوا لێیان خۆش بێ خوایە!))
لەبەردەمی ماڵە کوێخای، ڕەزای کوڕی عەلی دەشتی زەنگوڵەیەکی لە ملی خۆی کردبوو و لەسەر دیوارییەوە خەریکی زەنگوڵە لێدانێ بوو.
غلۆسین هاواری کرد: ((ڕەزۆ! .. ڕەزۆ!))
گوتی: ((دەڵێی چی غلۆسینۆ؟))
((ئەو زەنگوڵەت لە کوێ بوو؟))

((لەو پیاوەکەم ستاند.))

((لەکام پیاوەکەت ستاند؟))

((لەو پیاوە کوێرە یەک چاوەی لێرە لای کەرەکانیەوە وەستا بوو و تەماشای کا خواردنیی دەکردن.)) سەکینە هەروا دەگریا. دیسانەوە هەور و هەڵا لە بروسکەی دایەوە.

پلە قەمەر گوتی: ((بۆ کوێ چوو؟))

ڕەزا گوتی: ((کێ؟))

((ئەو پیاوە.))

((ئەو پیاوەی چاوێکی کوێر بوو و کەرەکانی خەریکی کا خواردنێ بوون؟))

((ئا.))

((ڕۆیی.))

((بۆ کوێ؟))

((بۆ باقراوایە.))

((ئەدی بۆ ڕانەوەستا.))

((ژنێ حەسەن شوانی بەخۆ و کۆڵەکایەکەوە، هات و گوتی:))

((ئەگەر لە ژنێ دەگەڕێی، وەرە کچەکەی من بەرە.))

پلە قەمەر بەدەنگێکی وەک دەنگی جیرجیرۆکەی، بەپەشۆکاوییەوە پرسی:

((فاتیلەی کچی دەگوت؟))

ڕەزا گوتی: ((ئا، پیاوەش چی نەگوت، ژنێ حەسەن شوانی هەر خێرا چوو دەستی فاتیلەی گرت و هێنای، گوتی: ئەوە زۆر لە سەکینۆی پلە قەمەرێش چاترە.))

دیسانەوە پلە قەمەر هەر بەهەمان شێوە دەنگەوە پرسی:

((ژنێ حەسەن شوانی وایگوت؟))

ڕەزا کەبەمل جووڵاندنێ زەنگوڵەکەی لێدەدا گوتی: ((ئا، ئەو دەم پیاوەکە هیچی نەگوت، ژنێ حەسەن شوانی فاتیلێی سواری کەرێ کرد و بۆ خۆشی لە پشتیەوە سوار بوو. بەپیاوەکەی گوت:

((لێخورە بۆ باقراوایە، بچین ماردی کەین و وەحەسێین. پیاوەکەش کەسواری کەرێکی دی ببوو، کەرەکانی دەنگدا و لێیاندا بۆ باقراوایە.))

سەکینە هەر دەگریا. ئاسمان گوور ڕاندییەوە. بەڵام هێشتا هەر داینەکرد بوو. ئیدی پلە قەمەر هیچی دیکەی نەگوت، دەستی سەکینەی گرت و پێکەوە چوونەوە کاولەئاشەکەیان. دەرکەکەی پێکدادا. دوای تاوێک دەنگی چەرخی ڕستنەکەیان لە پشت دەرکێوە بڵند بۆوە. دەنگی گریانێ سەکینەی دەدەنگی چەرخی ڕستنەکەیدا وندەبوو. غلۆسین هاواری کرد: ((ڕەزۆ! ئەو زەنگوڵە من خەریک بووم لە کابرای بستێنم بۆ خۆم.))

ڕەزا گوتی: ((نەخێر من لێم ستاند.))

((زۆر چاکە، ئێستا تۆزێکم وێنادەی دەملی کەم؟))

((هەر کاتێ لێی وەڕەزبووم وێتدەدەم، جارێش لێی وەڕەزنیم.)) و بەسەر دیوارێدا کەوتە هەلینگان. دەنگی زەنگوڵەی دەتەواوی کۆڵانێ گەڕا. ئاسمان گرماندییەوە. غلۆسین گوتی:

((کەنگێ لێی وەڕەز دەبی ڕەزۆ؟))

ڕەزا گوتی: ((جارێ دیار نیە، لەوێ دانیشە و چاوەڕێ بە، هەر کاتێ وەڕەز بووم دەتدەمێ لە ملتی کە.))

غلۆسین لەوێ لەسەر خۆڵێ دانیشت و پاڵی بە دیواریەوەدا. ڕەزاش هەروا لەسەر لێوی دیوارێ دەبەزی و دەنگی زانگوڵەش دەنێو گرم و هوڕی هەور و بروسکەی ئاسمانێدا لوول دەبوو.

---

تێبینی/ ئەم چیرۆکە لە کتێبەکەدا لە ژێر ناوی ((عاشقانە))دا نووسراوە، لەوەرگێڕانیدا بووە بە ((زەنگوڵە)) تکایە - وەرگێڕ-

لە کتێبی/ باغ اناری محمدی شریفی مجموعە داستان چاپ اول: ١٣٧١ نشر گردونەوە کراوە بە کوردی

هەرکە مامۆستای پیرو کەنەفت هاتە ژووری پۆلێ. ئەو قوتابییەی بەتەنێ لە نێومێز و کورسییەکاندا خەوبردبوو یەوە گوتی: ((هەستن!)) و دوای کەمێکی دی هەروا بەخەوەوە گوتی: ((دانیشن!)) مامۆستا تۆماری هاتوو و نەهاتووی قوتابییانی لەسەر لێواری پەنجەرە تەختەکە داناو لێکی کردەوە و چاویلکە زەڕەبینییەکەی دەچاوی کرد و گوتی: ((ئا بە نووسی!))

تاکە قوتابییەکەی ژووری پۆلێ بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی: ((نەهاتووە!))

((عەلی براتیانی!))

((بەڵێ هاتووە!))

((جەلالو ددەولەیی!))

((مامۆستا لەجەلالو ددەولەییرا تا دوایە کەس نەهاتووە.))

مامۆستای کەنەفت و پیر کە هەروا سەری بەسەر تۆماری هاتوو و نەهاتوواندا شۆڕکردبۆوە بەدەنگێکی ووشک و گڕەوە پرسی: ((ئەدی لە کوێن؟!)) عەلی براتیانی، تاکە قوتابی، باوێشکێکی هاتێ و گوتی: ((کەس نازانێ!))

مامۆستا تۆمارەکەی وێک نایەوە و لە تەنیشت تەختە ڕەشەکەوە ڕاوەستا. لە ناوەڕاستی تەختەکەی نووسی: ((وانەی ئەمڕۆ.))

لە دەری حەوشی قوتابخانەش قوتابی ڕیز نەبیوون تایەکێکیان لە تەنیشت داری ئەو ئالایەوە بووەستێ کەلەدار گەزی چێکرابوو.

بلێ: ((ئێمە هەمووومان دەزانین مامۆستا باوکی دووەممان و قوتابخانەش ماڵی دووەممانە!))

عەلی براتیانی، تاکە قوتابی پۆل، بەناو مێزو کورسییەکاندا هات و لە پێشەوە لەسەر کورسییەکی، گوێ مووچ، دانیشت. مامۆستاش کەهەروا یاری بەتەباشیرەکەی نێو دەستی دەکرد بەرەو لای پەنجەرەکەوە چوو و لە درزی شووشەکانەوە دەئاسمانێی هەڵڕوانی، ئینجا ڕووی لە عەلی براتیانی کرد و گوتی: ((پێم وانیە ئەورۆ بباریێ!)) مامۆستا دووبارە چۆوە بەردەمی تەختە ڕەشەکەو لەبن «وانەی ئەمڕۆ» دا نووسی:« نازانم چمە!» عەلی براتیانیش لەدەفتەری ڕاهێنانەکانی بەردەمی نووسی:« نازانم چمە!»مامۆستای پیر دوای کەمێک ڕامان ڕووی لەعەلی براتیانی تاقە قوتابی پۆلەکە کردەودو پرسی: «ئەرێ ئێرە پۆلی چەندەمە؟!)) مامۆستای کەنەفت گوتی: ((پێم وایە ئەورۆ دووشەممەبێ، پێم وانیە ئەورۆ بباریێ!)) .

دیسانەوە چۆوە بەرپەنجەرەکە و لە درزی شووشەکانەوە سەیرێکی ئاسمانی کردەوەو گوتی: ((دوو شەوان ڕۆژێکی لەبارنیە بۆ بارینێ!)) ئاسمان تاریک بوو، لە درزی شووشەی پەنجەرەکەوە دارکەوتێکی تینوو دەبینرا لە ناوەڕاستی حەوشێدا سەری نەوازشی بۆ شنەبای ئەو بەیانییە نەوی دەکرد و تۆزێکیش بەولاوە تر کوڕێژگێک دەستی دەگیرفانی جلکە ئاو دامانەکەی نابوو و فیت فیتەیەکی حەس حەسانی دەدەمی گرتبوو و بەردەوام فیتەی دەهات. لە تەنیشت کوڕێژگەکەشەوە، سەبەتێکی پڕ لە پەڕەکاغەزی منداڵان داندرابوو و تۆزێکیش بەولاوەتر. لەو جێیە ڕا کە دیواری قوتابخانەکەی لێوە دەست پێدەکرد، تەقڵەی کۆڵلارێکی بەو ئاسمانە تاریکەوە دەبینرا کە لەو سەری کۆلانێوە منداڵێک بۆی دەگریا. مامۆستای پیرو کەنەفت هاتەوە لای تەختە ڕەشەکە و بە تەباشیری سپی نووسی: ((قسەیەک نیە بیکەین!)) عەلی براتیانی، تاکە قوتابیی پۆل، لە دەفتەری ڕاهێنانەکانیدا نووسی: ((قسەیەک نیە بیکەین!))

دەنگی پێی یاریدەدەرە مرچ و مۆنەکە لە داڵانی قوتابخانە یرا نەدەهات. قاقای پێکەنینە مەشرەف خۆشییەکەی بەڕێوەبەریش هەر نەبوو مامۆستا پیرە ئەوەی هەر لە یادبوو کە هەمیشە پێکەنینەکەی بەڕێوەبەری بەمەشرەف خۆش ناو دەبرد بێجگە لەوەش، نەلەبەر و هەیوان و داڵان و نەلەناو پۆلەکانی دی هات و هاواری ((دارا دووی داری دی)) قوتابیان وە ((بێ مێشک چاک دانیشە))ی مامۆستایان هیچیان نەدەهاتن. مامۆستای پیر سەیرێکی دەرگا داخراوەکەی پۆلیی کرد. وە بیری هاتەوە کە هەر لەگەڵ هاتنە ژوورێی بۆ خۆی دایخستووە. بەرەو لای پەنجەرەکەوە چوو. عەلی براتیانی، تاکە قوتابیی پۆل، قەڵەمەکەی لەسەر دەفتەری ڕاهێنانەکەی ڕۆنا و لەبەر خۆیەوە کە تەنیا بۆ خۆی دەیزانی دەڵێ چی، دەستی بە گۆرانی: ((ئای ئای پەریخان ..)) کرد. دیسانەوە مامۆستای پیر لە درزەکانی شووشەی پەنجەرەکەوە، تەماشایەکی حەوشی قوتابخانەکەی کردەوە، ئاسمان تاریک بوو، کوڕێژگەکە دەستی هەر لە گیرفانی جلەکانیدابوو، و بەرامبەر پۆلەکە فیتفیتەکەی لێدەداو دەنگی گریانی منداڵەکەی بۆ کۆڵلارەکە دەگریا لەوسەری کۆلانێوە هەر دەهات. سەرەڕای ئەمانەش، دارکەوتە تینووە کە هێشتا سەری نەوازشی لەبەرامبەر شنەبایەکەی ئەو بەیانییە ڕاست نەکردبۆوە. مامۆستا پیرە هاتەوە لای تەختە ڕەشەکە ڕاوەستا، ویستی شتێکی لەسەر بنووسێ بەڵام دووبارە پرسی: ((ئەرێ ئێرە پۆلی چەندەمە؟!))

عەلی براتیانی دەستوبرد لە دەفتەری ڕاهێنانەکەیدا نووسی:

((ئەرێ ئێرە پۆلی چەندەمە؟!))

بێدەنگییەکی سامناک پۆلەکەی داگرتبوو. مامۆستا بڕوای وابوو کە ئەو بێدەنگییە تێکڕای هەموو لایەکی قوتابخانەکەی گرتۆتەوە. لە پڕ بەتووڕەییەکی لە ئەندازە بەدەرەوە هاواری کرد: ((ئێرە کوێیە؟))

عەلی براتیانی بێ ئەوەی منتەقی لێبێ لە دەفتەرەکەیدا نووسی: ((ئێرە کوێیە؟))

مامۆستا پیرە زانی پرسیارەکە ڕوون نەبوو. بۆ ڕوونکردنەوەی پرسیارەکەی قیژاندی ((مەبەستم ئەوەیە داخوا ئێرە قوتابخانەیە یاجێیەکی دی؟!))

عەلی براتیانی بۆ ڕوونکردنەوەی پرسیارەکەی دە دەفتەری ڕاهێنانەکەیدا نووسی: ((مەبەستم ئەوەیە، داخوا ئێرە قوتابخانەیە یا جێیەکی دی؟!)) مامۆستا پیرە لە پێستی خۆی هاتبووە دەرێ، دووبارە بەرەو لای تۆماری ناوی هاتوو و نەهاتوانەوە چۆوە ولێکی کردەوە و دەستیکردەوە بەناو خوێندنەوەی قوتابییەکان: ((ئابەنووسی؟!)) عەلی براتیانی قەڵەمەکەی لەسەر دەفتەرەکەی دانا، گوتی: ((نەهاتووە!))

((عەلی براتیانی؟!))

عەلی براتیانی گوتی: ((بەڵێ هاتووە!))

((جەلالود دەولەیی؟!))

عەلی براتیانی لەسەرخۆ گوتی: ((لێرەوە تاکۆتایی هیچیان نەهاتوون!))

مامۆستای پیر دووبارە پرسییەوە: ((ئەدی لە کوێن؟!))

عەلی براتیانی لەسەرخۆ گوتی: ((کەس نازانێ قوربان!))

مامۆستای کەنەفت و پیر تۆماری هاتوو و نەهاتووانی پێوەداو و بەرەو لای تەختە ڕەشەکە چۆوە. بەو تەختە سڕەی قوتابییەکان لە کۆنەکلاوی باوکی یەکێکیان دروستیان کردبوو تەختە ڕەشەکەی سڕیەوە، عەلی براتیانی، تاکە قوتابیی پۆلەکە، هەرخێرا و دەستوبرد لاستیکی ڕەش کردنەوەی لە گیرفانی دەرێناو هەرچی لە دەفتەری ڕاهێنانەکەیدا نووسیبوویەوە هەمووی ڕەش کردەوە هێشتاش قوتابخانەکە دەتگوت خۆڵی مردوویان پێداکردووەو لە چ جێیانەوە سرتەو کورکە و دەنگێک نەدەهات. مامۆستای پیر کەوتە خەیالان: خۆ بەیانی بەدەنگی زەنگی کاتژمێرە بەندۆڵ دارەکە لە خەوێ هەستاوە. تا ئێرە هیچ هەڵەیەک ڕووی نەداوە. دوای نانخواردنی بەیانیش وەک هەموو ڕۆژان بەرێی جاراندا هاتووە. خۆچاوەکانی ڕەشکەو پێشکەیان نەکردووە و لێشی تێک نەچووە.

بێجگە لەوەش ئەگەر ئێرە قوتابخانە نیە ئەدی ئەو دار ئالایە چیە؟ لە پڕ هاواری کرد:

((ئێرە قوتابخانەیە!))

عەلی براتیانی دە دەفتەری ڕاهێنانەکەیدا نووسی: ((ئێرە قوتابخانەیە!)) مامۆستای کەنەفت قیژاندنی:

((ئەگەر قوتابخانە نیە، ئەدی ئەو دار ئالآیە چیە؟!))

هەست و خوست نەبوو، دەنگ و چرپەیەک نەدەهات، بێدەنگیـیەکی ترسناک و بەسام. مامۆستای پیر هاتەوە لای پەنجەرەکە. جارێکی دیشی لە درزەکانی شووشەی پەنجەرەکەوە لە دەرێ ڕوانی:

((ئاسمان هەرتاریک بوو، بەڵام کۆڵلارەکە بەدارکەوتە تینووەکەی حەوشێوە گیرسابۆوە. و منداڵەکە فیتفیتەکەی بەملیەوە هەڵواسیبوو و لە تەنیشت سەبەتەکەوە دانیشتبوو. هەر پارچە کاغەزی لێ دەردێنان و بەو ناوەی وەردەکرن. گریانی منداڵەکەی ئەوسەری کۆڵانێ نەمابوو. مامۆستای پیر گەڕایەوە. لە خۆی بێزار و کەلەلا بوو. لەسەر تەختە ڕەشەکەی نووسی: ((هیچ قسەیەک نیە، نازانم چمە!))

ئیدی عەلی براتیانی نەیدنووسی، سەری بەدەفتەری ڕاهێنانەکەی کردەوە و دەخەوێکی قووڵەوە چوو. مامۆستای پیری کەلەلا. دە پانایی ژووری پۆلەکەدا دەهات و دەچوو. دوای چەند ساتە وەختێک و هەربەقسەی پێشووی خۆی. چەند ساتە وەختێکی کوشندە بوون. دیسانەوە هاتەوە بەر پەنجەردکەو لە درزەکانی شووشەکەی ڕادە دەرێی ڕووانی: ئاسمان هێشتا هەرتاریک بوو. دارکەوتەکە کۆڵلارەکەی لێبۆوەو بەرهەڵدای کردبوو. ئالآیەکە بەسەر دار ئالآکەوە هەروا شەکە شەکی بوو و منداڵەفیتەکێشەکەش لەوێ نەمابوو. لە جێی منداڵەکە هەر تیلمە کاغەزی دڕاوی پەرت و بڵاو بون بەدەم باوە.

مامۆستای پیر گەڕایەوە لای تەختە ڕەشەکە. پڕخەپڕخی لەسەر خۆی عەلی براتیانی، تاکە قوتابیی پۆلەکە،

بەشێوەیەکی نائاسایی بارودۆخی ژوورەکەی سامناک و ترسناک کردبوو. مامۆستای پیر ترسی لێ نیشت، دەرکەی کردەوە و بەخێرایی بەداڵانەکەدا تێپەڕی، گەییە حەوشێ کاتێ ویستی لە دەرگای قوتابخانەکە بچێتە دەرێ، ژنە فەڕاشەکەی قوتابخانەکە، کە، با، چاڕۆگەکەی دێنا و دەبرد بەدیتنێ مامۆستای پیر گوتی: ((قوربان، خۆ ڕۆژانی هەینی قوتابخانە نیە!))

مامۆستای پیر بەشڵەژاوییەوە گوتی: ((بۆ ئەورۆ دوو شەممە نیە؟!))

ژنه فەڕاشەکە گوتی: ((نەخێر، ئەورۆ هەینیە!))
مامۆستای پیر گوتی: ((ئەدی عەلی براتیانی بۆ هاتبۆوە؟!))
ژنه فەراشەکە بەشڵەژاوییەوە دە سەر و چاوی مامۆستای پیری هەڵڕوانی و گوتی: ((عەلی براتیانی دوو هەفتە لەمەوپێش تەمەنی درێژی بۆ ئێوە بەجێهێشت!))
مامۆستای پیر کە پشتاو پشت بەترس و لەرزەوە خۆی دەخزاندە کۆڵانێوە گوتی: ((...
...))

---

سەرچاوەی: کتێبی/ باغ اناری، محەممەدی شریفی، مجموعە داستان. چاپ اول: ١٣٧١. نشر گردوون-دوە کراوە بە کوردی. ٢٣ / ٦ / ١٩٩٩ دارەتوو

کوڕێژگەیەکی تەمەن هەشت نۆ ساڵانە. لە شارێکی نیمچە مام ناوەندی، نە زۆر گەورە و نەزۆریش بچوکدا دەژیا. کردبوویە خوو هەموو دەمە و خۆر ئاوایەک کەمانچەی هەڵدەگرت و دەچووە گۆڕەپانی شاری، لەوێ هاواری لە خەڵکی دەبەست و بانگی دەکردن: ((هۆ، هۆی خەڵکینە .. وەرن، وەرن گوێ لە مۆسیقا ڕاگرن..!)) بەڵام کەس گوێی نەدەدایەو بەلاقرتێوە بەلایدا ڕادەبوردن و ئەویش دەستی دەکرد بە کەمانچە لێدان، تا ماندوو دەبوو و شەوی بەسەردا دەهات، هەرکەوانەی کەمانچەکەی بەسەر ژێیە باریکەکانی کەمانچەکەیدا ڕادەکێشا، کە لێدە بۆوە و بەرەو ماڵ ملی دەناو شەکەت و ماندوو، زیاتر لە تاوی ئەوەی گوێیان لێنە دەگرت لەپەو ڕوو دەکەوت و خەو دەیبردەوە، تا ڕۆژێک لە دڵی خۆیدا بڕیاری دا بچێتە ناو دارستانی نزیکی شارەکەیان و لەوێ بەدوای داری ئەو درەختەدا بگەڕێ کە ئاوازی خۆش دەدات تا کەمانچەیەکی دیکەی لێ دروست بکات، بەڵکو ئێ ئەوە خوایە ئەمجارەیان گوێی لێبگرن، چونکە پێی وا بوو خەتای داری کەمانچەکەیەتی ئاوازەکانی خۆش دەرناچن و خەڵکی شاریش گوێی لێناگرن، بۆ ڕۆژی دوایی هەنگاوی بەرەو دارستانێ شل کردن و دەجەنگەڵێدا، دار بەدار دەستی بەتاقیکردنەوییان کرد. هەر گوێی پێوە دەنان و پتێکی لێدەدان داخوا زرنگەی دێ یان نا .. هەروا بەدەم گەڕانێوە کتوپڕ چوێلەکەیەکی پەککەوتەی باڵ برینداری چاوکرد، هەڵبەز و دابەزی بوو و نەیدەتوانی باڵەکانی لێکداو بفڕێ .. لێی نزیک بۆوە، هەڵیگرتەوە و خستیە سەر لەپی دەستی و تێی ڕاما، زۆری بۆ بەپەرۆش بوو .. لێی پرسی:

((چوێلەکە بچکۆلانەکە ئەوەکێ وای لێکردوویت و ئاوا باڵەکانتی زامدار کردووە..؟!))

وەڵامی دایەوە: ((کەس، من خۆم ویستم بەو ئاسمانە پان و پۆڕو بەرز و شینەدا بفڕم و بفڕم و بفڕم .. تا دەتوانم بەرەو بەرزی، هەر بفڕم و بفڕم و بفڕم .. هێندە بەرز بفڕم تاسەرم لە ئاسمان دەدا، بەڵام باڵەکانم تین و تواناى ئەو هەموو بەرزە فڕینەیان نەماو لەو بەرزییەوە کەوتمەوە خوارێ و ئەوا ئێستا دەبینی لێرە کەوتووم. کوڕێژگەی تاین، دەستەکانی بۆ گرمۆڵەکردن و هێنایەوە ماڵێ و دەستی بەتیمارکردنی باڵەکانی کرد .. هەرکە چاویشی پێی دەکەوت قسەکانی چوێلەکەکەی لە گوێدا دەزرینگانەوە ..

((تا دەتوانم بەرەو بەرزی هەر بفڕم و هەربفڕم)) لە تیمار کردن و بە دەور داهاتنێی داماندوو نەدەبوو، تاوای لێهات کەوتەوە سەر باڵە فڕە. سەر لە ئێوارەیەک کە چوێلەکەکە

بەیەکجاری چاک بێوو و برینی سەر باڵەکانی سارێژ ببوونەوە، کوڕێژگەکە کەمانچەکەی لەبن هەنگڵی ناو چۆلەکەکەشی خستە سەر لاشانێکی و بەرەو گۆڕەپانی شاری ملی لێنا، کەوتە کەمانچە لێدانێ .. بەڵام چۆن لێدانێک و چ ئاوازێک و چ دەنگ و نەوایەک. چاوی نابوونە سەریەک و لە دنیای ئاوازەکەیدا وەک چۆلەکەکەی بە پانتایی ئاسمانێدا دەفڕی و بەرز و بەرزتر دەبۆوە، لە ناخی ناخەوە دەهەژا بەهەموو هەست و نەستیەوە تێکەڵی ئاوازە خەستە بێ سنورەکەی دەبوو. هەر ئەو کەمانچەیەش بوو کە جاران پێی دەژەنی .. کەچاوی هەڵێنا.. چ ببینێ، ئەوا خەڵکی شاری ئاپوورەیان بەستووەو دەوردیان لێداوەو پاڵەپەستۆیانە بۆ دیتن و بیستنی ئاوازی دەست و پەنجە وردیلە ناسکەکانی ... وشادی چۆلکەکەی سەرشانیشی لەو خەڵکە ئاپوورە بەستووانە کەمتر نەبوو.... بەڵێ وای لێهات هەرکە ئەو مێرد منداڵە زیکەی لە ژێی کەمانەکەیەوە هاتبایە خەڵکی لە ماڵان دەردەپەڕین و بەرەو گۆڕەپانی شاری دەهاتن و گوێیان دەدایە ئەو ئاوازە خواوەندانەیەی لە ژێی ئەو ئامێرەوە بەدەست و پەنجەی ئەو مێرد منداڵە هەڵدەستا ..

ئێوارەیەک کە تازە خۆر وەکێوان کەوتبوو کوڕێژگەکە لە ناوەراستی گۆڕەپانی شاری دەستی بەژەنینی کەمانچەکەی کردەوە، هەروەک جاران خەڵکی لە هەموو کەلێن و کون و قوژبنێکی شارییەوە بە هەڵەداوان بەرەو گۆڕپانێ داوەرین .. و ئاپووردیان بەستەوە .. کەمانچەژەن چاوی لەسەریەک دانابوون و جارجارەش هەڵیدێنانەوە، تالە پڕ لە ناو جەرگەی ئاسمانێوە ئەستێرەیەکی گەشی پرشنگداری دیت ڕاکشا چۆلەکەکەی سەرشانی تەکانی دایە خۆی و بەرەو کەشکەشان لە شەققەی باڵیداو فڕی و هەرچی پارچەو پووچەی ئەستێرە کشاوەکە بوو کۆی کردنەوە و لێکی دانەوە و ئەستێرەکەی بردەوە جێی خۆی و دایناییەوە و بەپەلە هاتەوە سەرشانی ئەو هونەرمەندەو نیشتەوە ..

بەیانییەکی زوو خەڵکی شار لە بیستنی مەرگی کەمانچەژەنی بچکۆلەوە ئاگاهاتن، بەڕێ و ڕەسمێکی یەکجار زۆر شایستەی هونەرمەندانە لە گۆڕەپانی شاری لەو جێیەی کەمانی لێدەدا بەخاکیان سپارد و هەر لەوێش پەیکەرێکی وەک خۆی خنجیلانەیان بۆ دروست کرد و پەیکەری چۆلەکەیەکیشیان لەسەر شانی ڕاستییەوە دانا .. چونکە دوای مەرگی ئەو هونەرمەندە کەس چۆلەکەکەی نەدیتەوە .. بۆیە ئێستاش کە ئێستا یە هەر کەسێکی ئەو شارە بەو گۆڕەپانەدا ڕەت بێ، دەنگی ئاوازەکانی کەمانچەی ئەو

هونەرمەندەی لە گوێدا دەزرینگێتەوە.

---

تێبینی/

شەوی ٢٥ - ٢٦ / ٧ / ١٩٩٧ شەو درەنگانێک لە ئێستگەی مۆسکۆ بەشی عەرەبییەکەی بەبێ پێشەکی و ناوهێنانی خاوەن و سەرچاوەی ئەم چیرۆکە .. کابرای وێژەر ڕایگەیاند کە چیرۆکی ئەم شەومان کەمانچەژەنە و دەستیکرد بە خوێندنەوەی زۆر بەداخەوە کە ناوی نووسەرەکەی و ئەو سەرچاوەی لێی وەرگێراوە، وەگیرمنیش نەکەوت، بەڵام لە بەر ناسکی چیرۆکەکە زۆر بەدڵنیاییەوە دەڵێم: زۆر بەڕاستگۆیی و دەستپاکییەوە چیرۆکەکەم گواستۆتەوە سەر زمانی شیرینی کوردی .. جا تکا لە تێکڕای خوێندەواران و ئەو زاتانە دەکەم کە قولاغێکی خاوەنی ئەم چیرۆکەیان وەگیر کەوت پێم ڕابگەیەنن تامنیش لە لای خۆمەوە ئەوەی بۆ مافی خاوەنەکەی پێویستە لەبەر چاوبگیرێ ئەنجامی بدەم .. ((غریب)).

درەختەکان تازە وورده چرۆیان دەردابوو، شەوی پێشتر نەرمە بارانێک باریبوو، بەڵام ئەورۆ هەوا پاک و بێگەرد بوو. خەسرەو لە سەر تەختێکی ڕاکشابوو. دوای سێ مانگ نەخۆشی ئەوە یەکەمجاری بوو دەرکێ بکاتەوە. ڕەنگ و رووەکی سفت و سوڵ و چاوەکانی کزو مەستانەیان دەنواند سێ مریشک لە حەوشێ لەبەر پەنجەرەکە خەریکی پێپرکە بوون و چینەیان دەکرد. کەڵەباب و مریشکێکیش بەرەو لای حەوزەکەوە چوون، دەستیان بە ئاو خواردنەوێ کرد و لەگەڵ قووتدانی هەر دڵۆیە ئاوێکیش سەرێکیان بەلای یەکتریدا خوارده کردەوەو سەیرێکی یەکتریان دەکرد.

من لەسەر لێواری تەختەکەی خەسرەو دانیشتبووم. زۆر دەمێک بوو خەسرەو نەیدە هێشت کەسی بچتەلا. بەڵام من هەفتەی یەک دوو جارانم بۆ ئەحواڵپرسیە. سەر لەماڵێ وان هەر دەدا. لەگەڵ داکیدا دەدوام.

نازانم ئەورۆ چۆن بوو ڕێی سەردانی خۆی پێدام. من گوتم ((چاکە. ئێستا زۆر باشی هەریەک دوو ڕۆژی دیکەیە هەڵدەستیەوە.)) کە وەڵامی نەدایەوە، من سەرم لە دوو قسەکانی خۆم نا: من تا ئێستا چەند جارێکانت بۆ هەواڵپرسیە هاتووم. هەمیشە هەواڵی ساغی تەندروستیتم لە داکتان پرسیوە، ئەو

گوتی: ((بەڵێ دەزانم. وەک قسەکانم ماندووی کردبێ، بەلای دیواریدا وەرسوورا نێرەکتکێکی ڕەشیش هاتبووە لێوی حەوزەکە و بە پەنجەکانی ئاوەکەی لادەدا و دەیویست ماسیەکان بێنە پێشێ تا پریانداتێ و بیان فرێنێ خەسرەو دووبارە بەلای مندا وەرسوڕایەوە و گوتی: بۆ کتێبی تازەم بۆ ناهێنی؟

دکتۆر کتێب خوێندنەوەی لێ قەدەغە کردووم، هەر دەڵێی شێتە.))

- تۆش پەلەمەکە ددان بە خۆتدا بگرە بەڵکە تا ئەو چەند ڕۆژانەی دی چاکتریش دەبی.

خەسرەو کۆکەی هاتێ و دەست شۆرەکەی بۆ لای دەمی برد، گوتی: ((تۆ بەراستیتە و بیگۆمانی؟))

- بەڵێ، زۆریش، چونکە من باوەرو متمانەم زۆر بەو دکتۆرەیە، ئەوە بێجگە لەوەش کەڕەنگ و رووی تۆش سوور هەڵگەراونەوەو لوس و لێک و گەش دیارن.)) خەسرەو برۆیەکانی تێکنان. وەک ئەوەی بیرکردنەوە بۆ وی کارێکی یەکجار سەخت و دژوار بێت.

- بڵێی تا ئێستا چارەسەری نەخۆشی سیلیان دۆزیبێتەوە؟))

من گوتم: ((لەبارەی تۆوە سیل و میل لە گۆڕێ نیە. تۆ تەنیا سەرمات بوودو

پارێزگاریشت نەکردووەو لێت بۆتە ڕەقێتە و سینگ ئێشەیەکی سەخت و درێژخایەن.))
- باسکردنی بێسوودە؟ بەرگەی ناگرم.))
دیسانەوە ڕووی لێوەرگێڕامەوە.
لە ئێسکە دەرپەڕیوەکانی ڕوومەتیڕا دیار بوو مەرگ قوربانییەکی دیکەی تازەی هەڵناوە. بەڵام هەرگیز ئەوەم نەدەچووە مێشکی، چۆن دەبێ خەسرەو بمرێ؟ چۆن باوەڕبکەم؟ ئەو بەو هەموو ئومێد و حەز و ئارەزووەوە. لە پڕ بیری مەرگم لە مێشکیدا بەشێوەیەکی یەکجار زۆر ترسناک لە بەردەمدا بەرجەستە بوو هەرچی بێ سیلیش هەرهۆیەکە. لەوانەیە ئەگەر سیلیش نەبێ خەسرەو بە کۆڵانێدا بڕوا و پارچە خشتەیەکی بەسەر دا بەربێتەوەو بیکوژێ. بیرێکی ناخۆش بوو، هەموو لەشم لەرزی، خەسرەوێک بەو هەموو لاویەتیەو، بەو هەموو ئومێدەوە. خەسرەوێک بەو هەموو هەست و نەستە ناسک و پاکوخاوێنەیەوە دەبێ بمرێ. باشە خۆ دوای مردنی هیچ شوێنەوارێکی نامێنێ و تەواوی بوونی وی ودنەبوون دەگەڕێ. تەنیا گیانەکەی دەمێنێتەوە؟! بەڵێ.
لە ڕاستیدا لەو دەمەیڕا کە خەسرەو کەوتبووە ناوجێ، یەکجار زۆر گۆڕا بوو.
جاران لە نێو ئاوالاندا چەند ڕووخۆش و ڕووگەش بوو، دەگەڵ هەمووانی دەستبازی و جەفەنگ دەکردن. هەموو کەس پێی وابوو خەسرەو مرۆڤێکی سەردڕۆیە، بەڵام دوای شەو دەنگانێکی درەنگ کەپێکەوە دەماینەوە و دوا پێکمان پێکەوە هەڵدەدا و بێ ئەوەی ورتەمان لێبێ تێک ڕادەماین و ئەویش یان پارچە کاغەزێک یا پاکەتی جگارەکانی خۆی دەردێنا و وورد ووردی دەکردن و یان ئەو دەمانەی دوای خواردنەوێ قەوانێکی گرامافۆنی داویشتە سەرێ و گوێمان بۆ ڕادەداشت، ئالەو دەم و ساتانەدا دەکرا خەسرەوی ڕاستی بەڕاستی بناسی. من دەمزانی ئەوچیە. بەڵێ ئەو کاتانە ڕوون دەبۆوە کە ئەو مرۆڤە سەرەڕۆیە، لە ڕاستیدا چەند شەیدا و ئارەزوومەندە. ئەو هەرگیز پێی وانەبوو کە دەبێ بە ڕاشکاوی لەگەڵ کەسانی دیکەدا بدوێ. هەمیشە حەزی بە جەفەنگان بوو، بۆیە هەرکاتێ یەکێک لە ناوالەکانمان ژنی هێنابایە، ئەو دەیگوت: ((ئەوە فلانیش ژنی هێنا، تازە ئەویش سەنگین و ڕەنگین بوو. بۆویش واچاترە هێندێک وورده بەردان لەبەرکێ کا، تاقورستر بێت)) شەو درەنگان کەکەسمان بەدەوردوە نەدەما، ئەو قسانەی پێشووی بەجۆرێکی دی دەکردن: ((تۆ وەرە بیر بکەرەوە مرۆڤ بیەوێ ژن بێنێ. باشەکێ بێنێ، بۆ نموونە کچی فلانە بازرکان. یافلانە سەر فەرمانبەر، یان فلانە پارێزەر، تۆ پێت وایە هیچ کامێکیان لەو فاتیلە شل و شەپرێو و تەمبەلانەی خۆمانە چاترین؟ دەتۆ بیربکەرەوە کە

ئەوانە لە دوای هەر نانخـواردنێکی دەست بکەن بە قـرقـێنە دانێ، یان نیـوە شـەوێ گـۆرانیـیـەکـانی زینەتول ملوک لێـدەن و خـۆی بۆ ڕاژێنن. ئـیـدی تۆ ئەوەندەت بەسـە بۆ تاهەتایە و تاکۆتایی تەمەنت لە ژیان بێزاربی و بێزت لێی بیێتەوە.)) لەگەڵ ئەو هەموو گاڵتە پێکردن و نەفرەت لە ئافرەت کردنە شیدا، هەر من دەمزانی چەند شەیدا و چەندی حەز لە ژنە ...

جارێکیان لە فەرەنگیی حەز لە ژنێکی کردووە. ئەو خۆشەویستیەی بە هەزاران جۆر و شێـوە بۆمن باس کـردبێـتـەوە کـەمـە.. ئێـسـتـاش ئەوە ئەو خەسـرەوەیە کـە دەبێ بمرێ! دەودەمـەیدا کـەمن لە ئاوە سـەوزەکـەی نێـو حـەوزەکـە ڕامـابووم، دیتم وەرگـێـڕدراوێکی شۆێنهاوەری لە بن سەرینەکەی دەرێنا و هێندێکی لە پەڕەکانی هەڵدانەوە کاتێ ویستم ماڵئاوایی لە خەسرەو بکەم و لە ژوورەکەی وەدەرکەوم، لە ژوورەکەی تەنیشتیەوە دایکیم دیت لەسـەر عـەردی بەمـاتی دانیشـتـووە و سەرپۆشـەکەی لەسـەریەوە پێچاوە و گـوێی بۆ قسەکانی ئێمە ڕاداشتووە. هەرکە منی دیت لە جێی خۆی ڕاستبۆوە، سڵاوم لێکرد، دوایی منی بردە ژوورێکی بەولاوە ترەوەو لەوێ دەستی بەداخ هەڵرشتنی دڵی خۆی کرد.

– کـاک خـەسـرەو تەنیـا گـوێ لەتۆ دەگـرێ. دەبێ کـارێکی وابکەی ئامـۆژگـاریـیـەکـانی دکـتـۆری پەیرەو بکـات، چونکە بە قـسـەی ئێـمـە ناکـات و هیـچ گـوێ ناداتێ. من گـوتم: ((خانم، دەبێ ئێوەش زۆری لەگەڵ لەسەرەخۆبن. ئەو زۆر هەست ناسکە هەوڵدەن زیاتر بە گوێرەی حەزو ئارەزووەکانی وی ڕەفتار و هەڵس و کەوت بکەن.))

– کـاکـە: ئەگـەر دەزانی ڕاسـتـیـت دەوێ لێـرە هیـچ کـەسـێـک بەبێ مـەیل و حـەز و ئارەزوودکانی وی نەبێ ناجولێتـەوە. لەو ماڵەیدا کەس لام و جیمی لە قسەکانی ئەودا ناکـات. تەنانەت ڕێ بەکـەسـیـشـمـان نادات بچـینە ژوورەکـەی. شـتـێـکی دیش هەیە دەمەویست پێتـان بڵێم. یەک مانگی ڕەبەقە کچێکە ناشی ناسم هەموو ڕۆژێ خوا دایناوە سەرێک لێرە دەدا. خوشکەکانی خەسرەوی دەڵێن، کچی خێزانێکی ماڵە گەورە و چاکن. کەچی خەسـرەو بە ئێـمـەی گـوتووە هەرودخـتـێـک هات نەهێڵن بێـتـە ئێرە و دەریکەن کە ئەوەش کارێکی نەکردەنیەو ناکرێ دەریکەین. ئەو بەستەزمانە بێچارەیەش بەهەر شێوەو بەهەر زمانێک کە دەمانەوێ تێیگەیەنین، کۆڵ نادات و هەموو ڕۆژێ بەیانیان دەودەمەیدا بۆ هەواڵپرسیە دەگاتە ئێرە. ئێوە کارێکی وابکەن کە بۆ خۆی پێی بڵێ چیدی نەیە.

من پرسیم: ((ئەرێ ناوی فەروغ نیە؟))

- بۆ .. نا، بەڵام ڕاستیت دەوێ ئێمە شەرمێ دەکەین پێی بڵێین.)) من دە بیرەوە چووم و کە مترم ئاگا لە قسەکانی داکێ خەسرەوی و ئەو دەردەدڵ و سکاڵایانەی لە دەست کوڕەکەی دەیکردن هەبوو و نیرەییشی بەوە دەهات کە بۆ تائێستا هیچی دەربارەی ئەو کچە لەلای وی نەدرکاندووە. لە قسەکانیشی وادەردەکەوت کە ئەگەر بەدەست من بوایە، تا ئێستا دەمێک بوو دەرگای ئەو ماڵەم لە ڕوویدا دادەخست، بەڵام بەداخەوە کە خۆشکەکانی ناهێڵن. کاتێ کە خۆشەویستی ئەو دایکەم بەرامبەر خەسرەوی لەمێشکمدا بەرجەستە کرد ئەو قسانەی خوسرەویم وە بیرهاتنەوە کە ڕۆژێکیان پێی گوتم: ((ئایا دەشێ خۆشەویستی و میهرەبانی و دڵسۆزی لە دنیایەدا بنە هۆی دەردی سەری مرۆڤ؟))

دوایە گوتی: ((دوێنێ دکتۆر دەیگوت کە سوپاس بۆ خوا خەسرەو چاتر بووە. ئەگەر زۆریش ئاگای لە خۆی نەبێ و پارێزی نەکا لەوانەیە ئەو نەخۆشییە ساڵێ دوو جاران لەو کاتەدا بگەڕێتەوە، کە ئەوەش بۆ وی زۆر جێی مەترسییە. ودردو مەردی چابە وابکە هێندە نەخۆێنێتەوە.))

لەودیوی پەنجەرەکەوە خەسرەوم دیت کە لەژوورەکەی خۆی هاتۆتە دەرێ و لەسەر پلیکانەکانی ناوحەوشێ دانیشتووە. دایکی کورسییەکی دانیشتنی بۆ برد. منیش هەرچوومە حەوشێ و تەنیشتەوی، پێی گوتم: « هەتاوێکی چەند خۆشە!» دایکی گوتی:« خەسرەوخان دەبایە خۆت چاک بپێچیەوە» خەسرەو ڕووی لە من کرد و گوتی: ((بەڕاستی بەهار گیان وەبەر هەموو شتێکدا دەکاتەوە. ئەو دارشمشادانەی ماڵی مە تا دوێنێ هەموو ڕەش و برش و ناشیرین بوون، کەچی ئەو ڕۆ تێکڕای گەڵاکانیان سەوز و جوان و ڕازاوەن. تەنانەت ئەوانەی لە پایزیشدا مردبوون. ئەوا ئێستا دووبارە زیندوو بوونەتەوە.))

لەڕاستیدا ئەمە بارودۆخی سروشتی خەسرەو بوو. هەمیشە دەیویست و ئارەزووی بوو کەبیر و بۆچوونەکانی خۆی زۆر سادە و ساکارانە دەربڕێ و بیانگەیەنێتە خەڵکانی سادە. بەڵام زۆر جاران ئەو بیرو بۆچوونانەی خۆی بەشێوەی گاڵتەجاڕی و گەنجەفەوە دەگوتن. ئێستاش شێوە حاڵەتێکی سەنگینانەی دیکەی بەخۆوە گرتووە. تۆ بڵێی لەو دیوی دەرکێوە گوێی لە قسەکانی ئێمە نەبووبێ؟ وام دێتە بەرچاوان کە هەر ئەو خوسرەوەش زۆر لە مردنێ بترسێ. لەگەڵ ئەوەشدا کەتا ئێستا دوو جارانی هەوڵی خۆ کوشتنێ داوەو سەر نەکەوتووەو نەمردووە.

پاڵتۆیەکی تووکنی بەسەر شانەکانیدا دابوو. سەریشی دەناو یەخەبڵندەکانی پاڵتۆکەیدا

شاردبۆوە و لەسەر کورسییەکی لەبەر هەتاوێ دانیشتبوو. کە داکی هەستی ئەوەی کرد پێمان خۆشە بەتەنێ بین ڕۆیشت. بەڵام خەسرەو هیچ قسێکی نەکرد. حەوت هەشت چوێلەکە لەبەردەمی مە، لە ناو باخچەکەدا خەریکی گەمان بوون. تەنیا جیکەجیکی ئەوان و دەنگی دەسکی ئەو هاوەنەی گۆشتی کاڵیان تێدا دەکوتا گوێمان لە چ دەنگێکی دی نەبوو.

خەسرەو گوتی: ((لەگەڵ داکمدا لەچی دەدوان؟ بێگومان لە بارەی فەروغەوە. ئەو کچە تا ئێستا ڕەنگە هەزار جاری زیاتر بەمن گوتبێ بە قوربانت بم و لە دەوری سەرت گەڕێم. خوایە مەرگم پێش مەرگت کەوێ. هەرتەنیا بۆ ئەوەی من ئاوڕێکی لێبدەمەوە. ئێستا چۆنە تاقی بکەینەوە. با بزانین دەتوانێ قوربانی بدات.))

چاوە درێژکۆلەکانی خەسرەو دەودەمەیدا کەمێک خڕتریان دەنواند، وەک ئەوەی کەمێک گرژیان لێوە بتکێ.

- بەڕاستی لەمەبەستەکانت ناگەم.

خەسرەو پێکەنی و گوتی: ((مەبەست لەوەیە، چەژنی قوربانێ لە جیاتی شەکە قوربانیە، فەروغی بکەینە قوربانی.))

دیارە هەربۆیەیە خەڵکی دەڵێن خەسرەو شێت بووە و بۆ ئەوەش زیاتر لەو بارەیەوە نەدوێت هەستام و ماڵئاوایم لێکرد و ڕۆیشتم.

کات ژمێر و نیوێکی مابوو بۆ نێوەڕۆیە، کە لە ماڵێ خەسرەوی هاتمە دەرێ، زۆر نەچووبوو، چاوم بەژنێکی کەوت بەرەو لای ماڵی وان دەچوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرپۆشی لەسەر وچاوی خۆیەوە پێچابوو، هەر ناسیم کە فەروغە. لەوسەری شەقامەکەوە هەڵوێستەیەکم کرد، بەڵام نەگەڕایەوە پێدەچوو خەسرەو پێشوازی لێکردبێ. لە ڕاستیدا ئەو چەند قسانەی دواییەی خەسرەو دەبیرەوەیان بردم.

من و خەسرەو لە بانگهێشتنێکی ماڵە ناسراوێکی شاریدا پێکەوە فەروغمان ناسی. ئەو ڕۆژە فەروغ جل و بەرگی پوو لەکەداری لەبەر بوو، پرچەکانی زۆر جوان داهێنابوون و گودلەی بەسەر نێوچەوانیدا کردبووە چەتر کاتێ خاوەن ماڵ من و خەسرەوی بەوی و داکی ناساند، فەروغ زۆر سوورهەڵگەڕا. چونکە ئەوە یەکەمجاری بوو کە لە بانگهێشتنێکی ئاوا لەگەڵ دایکیدا بەبێ پەچە و سەرپۆش بێت. و هەروەها فەروغ هەر لەو ڕۆژانەشدا بوو کەلە پۆلی یازدە دەرچوو بوو و بروا نامەی (خوێندن تەواو کردنێ)ی وەرگرتبوو. لە سەر نانخواردنێ فەروغ لە نێوان من و خەسرەویدا دانیشت لەڕواڵەتدا چاودێری ئێمەیان بەو

ئەسپـاردبوو، بەڵام من لە ژێرەوە فەروغم دەدیت کە لە بەکارهێنانی کەوچک و چەقـۆ و چەنگاڵی گەورە و بچوک و دەستەسڕی کاغەزی، کەوەک کەللە قەندان لە دەوروبەرو سەر دەوریەکانیان ریز کردبوون، زۆر دەست و پێ سپی و دەستەپاچە بوو. خەسرەو ئەو رۆژە بە پێچـەوانەوە زۆر دڵ خـۆش و شـاد و روگـەش دەهاتە بەرچاو، بەبۆچوونی من وەک بـایی مـانگێکی دیکەشی گـەنجـەفـەو جـەفـەنگ وە دەست کـەوتبێ. لە کـاتێکا کـە فـەروغ بەشەرمەوە دانیشت بوو، و خەسرەو لێرەو لەوێ دەگەڵ هەمووان دەدوا و پرسیار و وەڵامی لێ دەکردن، جارێکیشـی روو لە من کرد و ولێی پرسیم: ((من و تۆ دەبێ لە هەمووان شاد و شەنگۆڵ و دڵ خۆشتربین کە فەروغیان لەگەڵ ئێمە داناوە.)) لە وەڵامی ئەو قسانەدا فەروغ هەستـایەوە و گوتی: ((بەپێچـەوانەوە من بەوە سـەربەرزم کەلەکـەسانی گەورە و رێزداری وەک ئێوەوە نزیکم.))

دوای نانخواردنی نیوەرۆیە من و خەسرەو دانیشـتبوین و شەترەنجمان دەکرد، هەندێ لە میـوانەکـانیـش لە ژوورەکانی تردا خەریکی چا خواردنەوە و قسـان بوون. پێم وابێ زۆربەی قـسـەکـانیـشـیـان لەسـەر خـەسـرەوی بوون. چوونکە بەو دوا دواییـە خـەسـرەو کـتـێبـە بەناوبانگەکەی تەواو کردبوو کە بەدواییێ نووسینی ئەو دەژمێردرا. داکێ فەروغی لەولاوە تر دانیشـتـبوو و خانەخوێش کچەکەی خـۆی کە کـتـێبـەکەی خەسـرەوی بەدەسـتـەوە بوو دەیخوێندەوە هێنایە لای ئێـمـە. هەر بۆ خۆدەرخسـتنیش پرسـیـارێکی کـەلە قـوتابییـەکی دەرچووی پۆلی یازدە بوەشێتەوە لێکردین و پرسی:

((بەرێزان ببـوورن لێـرەدا فـەرمـووتانە: تروسکەی ئەو چرایەی لە ژێر چەترە سـورەکـەدا دایـا، مانایەکی شاراوەی هێماداری دەبەخشی مەبەستتان لەمە چیە؟))

خەسرەو ئەسپـەکەی راگـرتبوو و خەریکی رۆینی بوو، بەڵام بۆ ماوەیەک پێی گرتەوە و بەزەردە خەنەیەکەوە گوتی: ((مەبەست ئەوەیە کە فەروغ خاتون ئاورێکمان لێبداتەوە و چایەکمان داتێ.))

فەروغی بێچارە لەو وەڵامە بێجێ یە سوور هەڵگەڕاو رۆیی. دوایە خەسرەو پێی گوتم: دیتت؟ نیوەی تۆیە.))

لەوە بەدواوە فـەروغ و دایکـیـان لە ((قـاوەخـانەی لالەزار))بێ سـەرپۆش و هەندێ جـاریش بەسـەرپۆشـەوە دەدیت. داکێ فـەروغی دەیزانی کـوێ نیـسکان دێنێ. خـەسـرەو جوانکیلەو لە خێـزانێکی رێزدار و بنەماڵە بوو. ئەوێستا هیچ کارێک و پارەو پولێکی نەبوو. بەڵام بۆ ئەو گرنگ نەبوو. چوونکە ئەوان پێویسـتیـان بە پارەو پول نەبوو. تەنیـا

شتێک کە داکێ فەروغی دڵ نیگەران دەکرد ئەوە بووکەلە ماڵێدا زۆر قیرسیچمە بوو. ئەوەشی لە نێو ژناندا بیستبوو. ئەوەش شتێکی وانەبوو، لەوانەیە لەگەڵ ژنەکەی ڕێک و پێک و خووورەوشتێکی چاکی بێ.

دوایە کە فەروغ بەجێیەکەی ئێمەی زانی، ئەوجا بەتەنێ دەهاتەوێ، لە دەوروبەری کات ژمێر حەوت تا هەشت خەسرەو تادەرکی ماڵێی دەبردەوە، هەندێ جارانیش خەسرەو کەپێی وابوو لەوانەیە فەروغ بێت، ئەو زووتر دەڕۆیشت و منیشی ڕەگەڵە خۆی دەدا. پەیوەندی ئێمە و فەروغ ئا بەو جۆرە بوو تا دووچاری ئەو نەخۆشیە هات.

لەو کاتەوە ئەوەیەکەمین جارە فەروغی دەبینێ و فەروغیش لە کاتی چوونە ماڵیان خۆی لە من دادەپۆشێ. بەئاشکرا بە داکیشی نەدەگوت کە دەچتە وێندەرێ. فەروغ خەسرەوی زۆر خۆش دەویست. لە هەمووشی گرنگتر قسەیەک بوو کە ئەوڕۆ خەسرەو دەربارەی فەروغ کردی. دەبێ مەبەستی چ بووبێ؟

بیروبۆچوونێکی پەرش و بلاو کە هەرگیز ناتوانم تانوپۆو ڕایەڵەکانی لێک گرێدەم. تا دوسێ ڕۆژان نەچوومەوە ماڵێ خەسرەوی. بەلام دڵم هەردڵی دەخواردەوە. ڕۆژێکی بەبەر ماڵێ فەروغی دا ڕابردم بێ ئاگایانە لە دەرکێمدا. نۆکەرەکەیان گوتی: ((خاتونەکان لە ماڵ نین))

کە چومەوە ماڵێ کاغەزێکی خەسرەویان دامێ دیتم نوسیویەتی کە تازوود بیگەمێ.

کەچووم خەسرەو کەوڵەمەرێکی دەخۆود پێچا بوو لە حەوشێ لەسەر کورسیەکی لەبەر هەتاوێ دانیشتبوو. لقەکانی دار قەیسیەکە کە تازە چرۆیان دەردابوو بەسەرسەریدا شۆڕببوونەوە و سێبەریان لێکردبوو. خوشکە بچوکەکەی لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو نارنجی بۆ پاک دەکرد.

خەسرەو گوتی: ((دەک بەخێرێی، شادیت لەگەڵ خۆت هێنا.))

- کوڕە وانا، شادی بەتۆوەیە.

زەردێکی هاتێ و مات بۆوە، هەربۆخۆی وابوو، من دڵم ڕانەدەوەستا. بەلام ئەو هەروەک خووی پێوەگرتبوو هەموو شتێکی بەسارد و سڕی و بەکاوە خۆ وەردەگرت. خۆشکەکەی پێکەنی و گوتی:

- دەفەرموو نارنجێکی بخۆ.

- خواتۆمان لێنەستێنێ و سایەتمان لەسەرکەم نەکا.

- هەی ئافەرین، بەڕاستی پێشوازیەکی لە جێی خۆیدا بوو.

ئیدی من وەلامێکی گونجاوترم وەگیر نەکەوت وەلامی پێبدەمەوە. خەسرەویش

ڕوالەتێکی ڕاشکاوتری بەخۆوە گرت.
من پرسیم: ((ئیشی چت پێم بوو؟ ئێستا، کە چوومەوە ماڵێ نامەکەی تۆم دیت.))
- ئیشێکی وام نەبوو. هەرویستم دەربارەی ژن هێنانی خۆم چەند قسێکانت دەگەڵدا بکەم.
بەشڵەژاوییەوە پرسیم: ((تۆ؟ ژن هێنان)؟ کێ؟
- لەگەڵ فەروغ!
- لەگەڵ فەروغ؟
- ها، واقت وڕماوە، جا ئەوە چییە؟ بۆمن نابێ ژن بێنم؟
بەوچاوە درێژ کۆلانەو ئەو دەموچاوە سێگۆشەییەوەی زەردەخەنەیەکی سەیری هاتێ. قۆڵم لەسەر کورسیەکە دادابوو، و قاچەکانیشم هاویشتبوونە سەریەک و گوتم: ((پیرۆزە))
بەڵام لە دڵی خۆمدا بیرێکی دیکەم کردەوە: باشە ئەدی ئەتۆ نەخۆش نی، تۆ نەخۆشی سیلتە. باشە فەروغی بەستەزمان گوناهی چیە کەتۆی ناسیوە. خەسرەوم لە پێش چاوان ونبوو، گۆنای دەرپەڕیوی پەیکەرێکی مردوویێکم لە جێی خەسرەوی لە سەر کورسیەکە هاتە بەرچاوان. فەروغ دەستی بەسەر ئەو پەیکەرە ئێسکیەدا دێنا..
خەسرەو کورسیەکەی لەمن نزیکتر خستەوەو گوتی: ((هەست دەکەم کەمێک سەرسام بیت و ئەم کاردی منیش بەکارێکی سەخت و نابەجێ بزانی، باشە تۆ دەزانی من چ ئێش و ئازارێک دەچێژم؟ داخوا دەزانی چۆن دەسوتێم؟ من لە تافی لاویمدا دەبێ بمرم. باشە بۆ؟ هەر تەنیا چوونکە لە خەڵکی دی چاترم. هەر تەنیا چوونکە من لە خەڵکانی دیکە چاکتر دەبینم و باشتر تێدەگەم. هەر لەبەر هەندێیە خەڵکی دی تاموچێژوو کام لە ژیان دەکەن و من ئازار دەچێژم .. لەوەش بترازێ کێ دەڵێ من دەمرم. ئەوە هات و چاکتر بووم. بەڵکە ئەو ژن هێنانە تەندروستیم چاکتر کات. ئەدی تۆ بۆخۆت نالێی من سیلم نیە، نەخۆشیەکەم کۆتایی هاتوە. کێ دەڵێ فەروغ لەگەڵ مندا بەدبەخت دەبێ. بەڵکە خۆش گوزەران و ئاسودەو خۆشبەخت بێ.))
ماوەیەک هەروا دەدوا و قسەی دەکرد و منیش تێی ڕامابووم. دوا قسەکانیشی ئەمانە بوون:
((بۆچی بەرگری لە خۆم بکەم. ئەو هێزەی منی سیلاوی کردووە و دەیەوێ بمکوژێ، هیچ بەرگریەک لە خۆی دەکا؟ منیش هێز و توانایەکم و دەبێ گۆڕەپانێکی پان و بەرین بۆ بای باڵی خۆدانێ پەیداکەم.))

هەرچەندە قسەکانی قنیاتیان پێ نەکردم، بەڵام ڕاستیشی دەکرد. قسەکانی ویم چوونە دە دڵی. ئیدی ژن هێنانەکەی ئەو سەرسامیەی کەلە سەرەتادا هەوتی کردم، وورده وورده ڕەوبەوه. بەڵام لەلایەکی دییەوە دوو دڵ بووم. لەوەی دەترسام کە تەواوی نەخشەو پلانەکەی خۆی پێنەگوتبم. هەرچۆنێ بێ پەسندم کرد. بۆخۆشی لەپێشدا لەگەڵ فەروغیدا دوابوو. هەروەها داکێ خەسرەویش ئەو زەماوەندەی زۆرپێخۆش بوو و بەڵێنی هەموو جۆرە کۆمەکییەکیشی دابوو، دکتۆریش ئەو کارەی پەسند کردبوو/ بەڵام بەوریاییەوە، و گوتبووی: ((لەوانەیە بۆ خەسرەوی زۆرباش بێ، لەوانەشە بۆ هەردووکیان ترسناک بێت.))

خەسردو نەخشەکەی خۆی ئاوا بەم جۆرە بۆ ڕوون کردمەوە: ((بریارم داوە زەوییە میراتییەکەی شەهریار بفرۆشم و بەپارەکەی کەنزیکەی دوازدە هەزار تومان دەبێ. لەگەیلان یان لە لاجانێ و یا لەنزیک دەریایە پارچە زەوییەکی دەکرم و هەر لەوێش خانووێکی دروست دەکەم و سەرقاڵی کارێکی دەبم. هەر واشم نیازە کەدەو خانوودیدا ژنێ وەگوێزم» منی ڕاسپارد کە لەگەڵ داکێ فەروغیدا بدوێم.

سەرەنجامی ئەو کارانە نزیکەی هەشت مانگ و نیوی خایاند هەر چەندە داکێ فەروغی لەبەر نەخۆشییە خەسرەوی بەو کارەی تۆزێک نیگەران بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەسەرخۆی نەهێنا چونکە بۆ خۆی پێی خۆش بوو. داکێ خەسرەویش کە دەیدیت کوڕەکەی خۆشحاڵە و جارجارەش بەدەمیەوە پێدەکەنێ، زۆر شاد و ڕووگەش بوو. هەقیشی بوو، چونکە ژن هێنانی کوڕان و شووکردنی کچان یاد و بیرەوەرییەکی زیندووی سەردەمی زەماوەندی داک و بابانە. لە ڕوودسەر لە کەناری دەریایە خانووێکی کوێستانی کەبەسەر دەریایەیدا دەڕوانی و هەیوانێکی پان و پۆڕی هەبوو و جامخانەیەکی سەرتاپا شووشەبەندی تێگیرابوو سێ مانگەی هاوینێ من و خەسرەو سەرقاڵی نۆژەن کردنەوەی ئەو خانووە بووین. بەشێوەیەکی سەرپێی خانووەکە کڕدرا. خەسرەو پێی وابوو کاتێ کە لەگەڵ خەڵکی گەڕەکێ ئاشنا بوون ئەوددمی زەوییەکەش دەکڕن.

بۆ نۆژەن کردنەوەی ئەو خانووەش ئەوپەڕی ووردەکاری تێدا بەکارهاتبوو، خەسرەو ئەو خانووەی وا دەستوور دابوو کە یەکجار زۆر کەشخەی دەنواند. کەل و پەلی ماڵەکەیان لە چاکترین کۆگا و موغازەو پێشانگایەکان و بەباشترین سەلیقەوە کڕین. من دەڵێم سەلیقە، بەڵام هیچیشیان بەدڵی من نەبوون. بەڵێ، مۆبێلی نەرم و خۆش. قاڵی و ڕایەخی جوان و ڕازاوە بەنەخش و نیگارو وێنەی جوان. پەردە پەنجەرەی ئاوریشم، چل چرا و قەندیلۆکەی دەستکاری ئەسفەهان. چارپایە چرا کەهەمووی لە دار و تەختەی قورس و پتەو دروست

کرابوون. هەموو ئەو شتانە کەیەکجار زۆریش جوان بوون، بەڵام خەسرەو ڕەنگی سەیر و سەمەرەی لێ هەڵدەبژاردن. دوو هەزار تومـان بە ژووری نوسـتنێ درا کە خەسرەو پێی دەگوت ((ژووری بووکێ)) تەواوی ڕەنگی شتەکانی ئەو ژوورە هەموو ڕەنگی زێرکفت بوون. دیسانەوە دەیلێمەوە، کە ئەوانە هیچیان بەدڵ و حەز و ئارەزووی من نەبوون. ڕۆژی هەژدەی مانگی بەهمەن کە لەڕۆژ ژمێرێدا نووسرابوو بووک گواستنەوەی تێدا پیرۆزە، بووک و زاوا لە ماڵێ داکێ فەروغی مارەبیان بڕی. هەر ئەو ڕۆژە فەروغ و خەسرەو پێکەوە بەرەو ڕوودسەر هاژوایان.

دووسبەی ئەو شەوە من و داکێ خەسرەو و فەروغ پێکەوە بە ئوتومبێلێکی هۆدسن لە لاجانێ تێپەڕین. بڕیار وابوو دەمە دەمی ئێوارێ بووک و زاوا بچنە نێو خانووە نوێیەکەوە و ئێمەش بۆ بەیانی لەوێ بین بایەکی توندی دەهات بەفری بەدردەختانەوە نەهێشت. نارەتەیەکیش کە کەس نەیدەزانی لە گەرووی بایەکەوە دێت یا سروشت بۆ خۆی وا دەکات، کەوا بەو شێوە سەیرە کار لە ناخی ناوەوەی مرۆڤ دەکا. داکێ خەسرەوی و داکێ فەروغی هەردووک پێدەکەنین، بەڵام من چاوەڕێی پێشهاتێکم دەکرد. دڵم وە پەلە پەل کەوتبوو. ئوتومبێلەکە بەڕێی پڕ لە بەفر و بە قوڕێگیراو دا هەر ئێرە و ئەوێی بوو و تا دەهاتیش ئێمەی بەرەولای ئەو خانووە نزیکتر دەکردەوە کە بەلای منەوە خانووێکی یەکجار سامناک بوو کاتژمێر نۆ و نیو لە بەردەرکێ ڕاوەستا. دەرکە کرابۆوە و خزمەتکار و بەردەستیش دیار نەبوون. لە نێو ماڵێش وەک باوە، کەسمان بەپیرەوە نەهات و فەرمووی لێنەکردین. هێشتا چرای دوێ شەوێ هەردەسووتا و دووکەڵی دەکرد. لە ڕۆژێکی وا کەبووکی تێدا دەگوازرایەوە، نەدەبوو ئەو ماڵە ئاوا بێدەنگ و کش و مات بێ. لە پلیکانان وە سەرکەوتین. لە دالانی نهۆمی یەکەم کابرایەکی ئەرمەنی کە کەمانچەکەی هەر دە دەستیدا بوو لە سەر لاتەختێکی خەوی لێکەوتبوو پرخەی دەهات. لە تەلارێ گەورەشدا چەند شووشە و پەرداخێک کەوتبوونە سەر عەردی، و هەندێ چرای دیش هێشتا هەر دایسان لەلایەکی دی ڕا کەکەس نەیدەزانی کوێیە بایەکی سارد بە تەواوی نێو ماڵەکەیدا دەهات بەشێوەیەکی وا هەرچی پەردە و چراو قەندیلۆکە هەبوون هەمووی وە هەلەکە سەما خستبوون. هەرجارەو لە پڕ دەرگایەک دەکرایەوە و زۆر بە توندی بە دیواریدا دەدا. ئاگام لە ژنەکان بڕا. شارەزای ماڵەکە بووم. یەکەمجار چوومە ژووری نوستنێ. لێفەو سەرینی سەرچارپایەکە پەرش و بڵاوکەتبوون، بێ ئەوەی کەسیشی لێبێ. بایەکە لەلای هەیوانێوە ڕادەهات. دەستوبرد چوومە وێ تا پەنجەرەکان داخەم. بایەکی سارد دەناو

خانووەکەیدا هەڵیکردبوو پێتەڵووکەی دەوێدا بە بەفرێ دەکرد. لە پەنجەرەیڕا دەریا دیار بوو، کەفی کردبوو، شەپۆلەکان بەتوندی خۆیان بە دیواری خانووەکەدا دەدا، وەک بیانەوێ لە بناغــەوە هەڵیکەنن و ژێرەو ژووری کــەن لە نزیک پەنجــەرەیەکــەوە فــەروغ بەخــۆ و کــراسێکی سپی درێژ و سەرو پرچێکی ئاڵۆزەوە لەوێ لەســەر عــەردی کــەوتبــوو. لە پێــشــداوامــزانی مــردووە. وورتەی لێنەدەهات و نەدەبزووت. لەشی ســارد ببــۆوەو پێــخــواســتــیش بوو. کــەلێی نزیک بوومــەوە هەلمگرتەوە و دەســەرو چاویم هەڵڕوانی، بە چاوەکانی ئاماژەی بۆ دەریا کرد.

دوای ساڵێک فەروغیش بە نەخۆشی سیل مرد

ئەو بە قوربانی هەمووان بوو، ئەمیش بە قوربانی ئەو

---

ســەرچاوە/ لە کــتــێبی - چمــران - چاپ اول، نگاه: ۱۳۷۷ (چاپ مکرر)مــوســه، انتشارات نگاه: خیابان (۱۲) فرودین شماره، ۲۱ ، ۲٦ / ۱۱ / ۱۹۹۹ دارەتوو

((هێلکەو ناوێن ڕەییس؟))
((کێت دەوێ، پاسگا؟))
((ڕەییسی پاسگام گەرەکە))
((پاسگا چۆڵە))
((هەورێکی چەند ڕەشە! ئەوشۆ باران وەک کوندەی سەر بەرەوژێر دادەکا))
((جارێ هەر ئێوارەیە، خۆ شەو دانەهاتووە.))
((ئەتۆ کوڕی کێی؟ سەربازی؟))
((نەخێر، ئەمن ڕەحمەتۆی کوڕی سەید عەلیم. هێشتا وەختی سەربازییەم نەهاتووە.))
((کوڕی کام سەید عەلیت؟))
((ئەو سەید عەلیە کورتە بنەی لاقی چەپی شەلە.))
هاواری کردەوە: ((هێلکە و ناوێن ڕەییس؟))
((پاسگا کەسی لێ نیە))
((ئەدی چوو ونە کوێ؟))
((نازانم. کەمن هاتم پاسگا چۆڵ بوو.))
((بۆ شکایەتێ هاتووی؟))
((نەخێر، چ داوایەکم نیە.))
((ئەدی بۆ هاتووی؟))
((بۆ خۆڵە پەتانێ و گەمان هاتووم.))
هاواری کردەوە: ((هێلکە و ناوێن ڕەییس))
هاوارەکەی چەند جارێکانی دەدالانێ پاسگایدا دەنگی دایەوە:
((هێلکە و ناوێن ڕەییس؟.))
((هێلکە و ناوێن ڕەییس؟.))
((هێلکە و ناوێن ڕەییس؟.))
((پاسگا کەسی لێ نیە.))
((کەنگێ دێنەوە؟))
((ئەمن چووزانم، کەمن هاتم پاسگا چۆڵ و هۆل بوو.))
((هەورێکی چەند ڕەشە! ئەوشۆ باران وەک کوندەی سەر بەرەو ژێر دادەکا))

ڕەحمە تۆ لە حەسارێ پاسگای لەناو خۆڵێ دانیشت و دەستیکرد بەگەمان.
با .. بێتەلەکەی پاسگای هەڵدابوەوە بن دار باوییەکە. دار باوییەکە لق و پۆپی بە گوڵان داهاتبوو.
((با))ش ووردە ووردە گوڵە باوییەکانی بێردو بەوێدا دەدان و دەیوەراندن.
((ئەهوە بەهەوپای چ دروست کەی؟))
ڕەحمە تۆ گوتی: ((باغ))
((ئەوشۆ بارانێکی وا دادەکا، مەگەر خوا، دەنا هەموو جێیەکی دەبا.))
((جا خۆ دار و باری تێدانیە))
((چی؟))
((باغەکە))
((خۆزیا رەییس پاسگا دەهاتەوە.))
((لەوانەیە بێتەوە. ئەو دەمەی من هاتم پاسگا چۆڵ بوو. سەربازەکانیشی لێنەبوون. ترومبێلی پاسگایە کەشی هەرلێنەبوو .. تەنیا دوو پشیلە نەبێ لەبن دارباوییەکە گەمەیان دەکرد، ئەوانیش کەمنیان دیت تێیان تەقاند و هەڵاتن.))
زۆر لە دووری پاسگاکەوە برووسکەیەک لە چیایەکەیدا و گرمەی هات. ڕەحمە تۆ هەروا بەدەم گەمانەوە بەتیلەی چاوان لە پیرێژنێی دەڕوانی، گوتی: ((ئێوە میمکە کوبرا نین؟))
((نەخێر، من خەڵکی گوندی وەنیم، خەڵکی گوندەکەی خوارێم.))
پیرێژن سەیرێکی هەورە ڕەشەکەی کرد. هەوا تا دەهات تاریکتر دەبوو. لەودیو دیواری پاسگایەکەوە میاوە میاوی شەیدایانەی دووپشیلە دەهاتنە گوێ. (با)ش هەروا گوڵە باوی بێردو بەوێدا دەدان و دەیوەراندن. ڕەحمە تۆ چوار لادیواری چووکەڵەی لە قوڕێ هەڵنابوون و چوو بوو لەولاو لایانڕا چیلکە و داری بۆ باغەکەی هێنا بوون. هێنانی و لەوێی هەڵڕشتن و یەکە یەکەی لە زەوی ڕۆکردن و چەقاندنی پیرێژن چارۆگەکەی سەری لەبن چەناگەیەوە توند توند گرتبوو و جارجارە تەماشایەکی دالانێ پاسگای دەکرد و جارەجارەش دەڕەحمەتۆی ڕادەما. دیسانەوە لە سەرخۆ گوتی:
((هێلکە و ناوێن ڕەییس؟.)) دەنگەکەی سێ جاران دەنێو دالان و ژوورە چۆڵەکانی پاسگایدا، هات و چوو. ڕەحمەتۆ گوتی: ((گوتم کە، پاسگا چۆڵە و کەسی تێدانیە.))
((نەدی کەنگێ دێنەوە؟.))
((نەمن چووزانم، کاتێ کەمن هاتم کەسی لێنەبوو. تەنیا دووپشیلە نەبێ لەبن دار باوییەکە پێکەوە گەمەیان دەکرد. هەرکە منیان دیت تێیان تەقاند و هەڵاتن.))

پیرێژن فلّقە پێکەنینێکی لە سەرخۆی هاتێ، گوتی: ((هەر ئەو پشیلانەی ئەوا ئێستا دەنگیان دێ؟))

ڕەحمەتۆ گوتی: ((ئا، هەر ئەوانەی کە وا دەنگیان دێ، لە بن دارەکە بوون.)) پیرێژن دیسانەوە دەئاسمانێی هەلّڕوانییەوە، گوتی:

((ئەو هەورە ڕەشە شتێکی بەچاویەوە، ئەوشۆ باران زۆر دەبارێ.)) ڕەحمەتۆ بەسەرسوڕمانێکەوە تەماشای کرد، گوتی: ((ئێوە ناوتان چەشە؟))

((من خەلّکی گوندی وەنیم، خەلّکی گوندەکەی خوارێم.))

ڕەحمەتۆ گوتی: ((ئەها سەیری ئێستا پڕە لە دار و درەخت!))

پیرێژن گوتی: ((چی؟.))

((باغەکەم.))

پیرێژن نەرمە زەردەیەکی هاتێ گوتی: ((سەرەتای بەهارێیە و کەچی باغەکەت ووشک و برینگە!))

((ئێستا باران دەبارێ و پڕ دەبێ لە ئاو. درەختەکانیش چرۆو گەلّا دەردەکەن.))

دەنگی دووپشیلەکانیش کە زۆر لە جاران شەیدایانە تربوون لەو دیو دیوارە بلّندەکانی پاسگاوە بێ پسانەوە و بەردەوام دەهاتنە گوێ. پیرێژن سەرێکی کێشایە نێو دالّانی پاسگایەکە، لە سەرخۆ گوتی:

((هێلکە و ناوێن ڕەییس؟.))

دەنگەکەی وەک نالّە دەچوو. ڕەحمەتۆ خەریک بوو دەترسا.

ڕاستبۆوە، گوتی: ((پاسگا چۆلّە.))

پیرێژن گوتی: ((ئەدی کەنگێ دێنەوە؟))

((ئەمن چووزانم. کە من هاتم پاسگا چۆلّ و هۆلّ بوو کەسی لێنەبوو، تەنانەت تروومبێلی پاسگایەکەشی هەر لێنەبوو. تەنیا دوو پشیلە نەبێ لە بن دار باوییەکە خەریکی گەمان بوون پێکەوە، ئەوانیش، هەرکە منیان دیت تێیان تەقاند و هەلّاتن.))

پیرێژن بەسپایی پرسی: ((نازانی چوونە کوێ؟))

((کێ؟))

((ڕەییس پاسگا و سەربازەکانی.))

((ئەمن چووزانم. ڕەنگە هەر نەشیەنەوە.))

پیرێژن پێکەنینێکی هاتێ، گوتی: ((بۆ دەشبێ ئیدی هەر نەشیەنەوە؟!))

ڕەحمەتۆ لە پەنا دیوارە قۆرینەکانی باغەکەی دانیشتەوە، گوتی:

((من نازانم، ئێوە بۆ شکایەتێ هاتوون؟))

پیرێژن گوتی: ((نەخێر، من خەڵکی گوندی وەنیم. من خەڵکی گوندی خوارێم))

ڕەحمەتۆ سەیرێکی ئاسمانی کرد. برووسکەیەک لە دووری دیوارەکانی پاسگاوە لە کێویدا و گرمەی هات.

پیرێژن گوتی: ((هەورێکی چەند ڕەشە! ئەوشۆ خراپ دەبارێ))

ڕەحمەتۆ گوتی: ((باشتر، ئەوددم درەختەکانم هەمووشین دەبن.))

میاوەمیاوی پشیلەکان زیاتر ببوو. لەو دیوی دیوارەکانی پاسگاشەوە، دەنگی گومان ئاسای درەختەکانیش بەددم بای ئێوارە وەختەوە لوولی دەخواردو هاشەی بوو، هەوا کەمێک تاریکتربووبوو.

پیرێژن دووبارە لەبن لێوانەوە گوتی:« هێلکەو ناوێن ڕەییس؟» دەنگەکەی وەک ناڵە دەچۆوە.

ڕەحمە تۆ بەناراحەتیەوە بلند بوو. گوتی:« پاسگا چۆڵە کەسی تێدانیە.))

ڕەحمە تۆ گوتی: ((دوێنێش کەمن هاتم هەرچۆڵ بوو و کەسی تێدانەبوو.))

پیرێژن بەدەنگێکی زۆر نەرم وشلەوە پرسی: ((ئەدی کەنگێ دێنەوە؟))

ڕەحمەتۆ گوتی: ((ئەمن نازانم. لەوانەیە ئیدی هەر نەشیەنەوە.))

پیرێژن گوتی: ((عەجایب!))

ڕەحمەتۆ گوتی: ((بۆ ئێوە بۆ شکایەتی هاتوون؟))

پیرێژن گوتی: ((نا، من خەڵکی گوندی وەنیم.))

ڕەحمەتۆ سەیرێکی دار باوییەکەی کرد. دارباوییەکە وەک تارماییەکی گەورە دەتاریکییەدا هانکەهانکی بوو و سەمای دەکرد. پیرێژن سەرپۆشەکەی وەلانا. هێلکەکانی هەموو بەدالانی پاسگایەکەیدا وەرکردن و بە ئەسپایی و لەسەرخۆ لە حەساری پاسگایەکەی وەدەرکەوت. لە پڕ بۆنی بوخورێکی خۆش بەنێو پاسگایەدا بڵاو بۆوە. ڕەحمەتۆ سەیرێکی دالانێ پاسگای کرد. دەنێو بوولێڵی دالانەکێدا هێلکەکانی دیتن. بەواقی وڕەوە سەیرێکی ئەولاولای خۆی کرد، پیرێژنی نەدیت.

دەنگ و زەنای جووتەی پشیلانیش لەو دیو دیواری پاسگاوە گەیبووە کلۆیان. ئاسمان نم نم دایدایە بارانێ. ڕەحمەتۆ بەشڵەژاویەوە باغەکەی تێک و پێک داو بەنێو تاریکیدا هەڵات. لەولای پاسگاشەوە، لە شوێنێکی زۆر دوو ڕەوە، دەنگی نەقارەی دەهاتە گوێ. ژنان تێکیانەوە دەدا و تیشکی ڕوناکییەکانیش لەو دوورەوە دەهاتن و جێ گۆرکێیان بوو، بەغار بەرەو لای وان چوو. بۆنی جاترە بەو ناوەدا بڵاو ببۆوە. بارانیش نم نم دەباری.

---

سەرچاوە/ باغ اناری - محمد شریفی (مجموعه داستان) - چاپ اول ۱۳۷۱ نشر گردوون.

فرۆکەکان هێندە لەپڕ لەودیو چیاکانەوە پەیدا بوون، فەرماندەی کاروانەکە بە هیچ جۆرێک بەوە ڕانەگەیشت ئوتومبێلەکان بڵاوە پێ بکات. هەر هێندەی پێ کرا تفەنگێکی تاودایە و دەرپەڕییە دەرێ. ئوتومبێلچیەکانی کە لەسەر گازی پشت خۆیان بەزەویدا دابوو و بەرامبەر ئەو بۆمبا هاوێژانەی خۆیان لوول دەدا و هێرشیان دەهێنا، لوولەی چەکەکانیان تێ کردبوون و تەقەیان لێدەکردن. ئەوان چاوەڕێی فەرمانی تەقە نەبوون، هاڕەو زیکەی فرۆکەکان تادەهات توندتر دەبوو، تاوای لێهات پەردەی گوێی دەدڕی. تەقینەوەیەکی ترسناک، گەردەلوول و تەپ و تۆز و بۆگەنی بارووتی بەهەوادا بڵاو کردەوە. یەکێ لە بۆمباکان نێچیری خۆی پێکا، بڵێسەی ئاگر یەکێک لە ئوتومبیلەکانی لەخۆیەوە پێچا، نامانجی هێرشەکەش هەر ئەو ئوتومبێلانە بوون کە برنجیان بارکردبوو. ئوتومبێلچیەکان بێدەنگ هەریەکەیان بوونە جەنگاوەرێک، و دەستیان بەتەقە کرد. ئەوان لوولەی تفەنگیان کردبووە فرۆکەی لە دەنگ خێراتر.

چەکێکی وانەبوو تەنیا - تفەنگ - نەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا ناچاری تەقەکردن بوون، هەرچۆنێک بوو دەیتوانی زۆر کاریگەربێ، ئەگەر بۆشیان نەخرابایە، مەبەستی ڕاستەقینەیان دوورخستنەوەی هێرشی فرۆکەکان بوو، لە هەموو شتێ گرنگتر، ئەوان دەبوایە برنجەکە ڕزگارکەن. هەر چەندە فەرماندەکەیان دەیزانی هەموویان تەقە دەکەن بەڵام تەقەکە نارێک و پێک بوو. دەستڕێژی چڕوپڕ پێویست بوو، بۆیە لە ناوەڕاستی ڕێگاکە ڕاوەستاو هاواری کرد: ((هەمووتان پێکەوە!)) دەستڕێژەکە تادەهات کۆک ترو توندوتیژتر دەبوو فەرماندە هاواری کرد: ((دەستڕێژ، دەستڕێژ!)) دوای تۆزێک ئەو ئێش و ئازارەی کە گێژی کردبوو و جینگڵی پێدەدا، خەستی، تەزووی ئازاری قاچی وەک برووسکە هەموو گیانی تەنی، و کاری لە مێشکی کرد، و لە هۆش چوو. کە بەهۆش هاتەوە، خۆی لەکەناری ڕێگاکەی تەنیشت مەرەزەیەکی برنجەوە بەدی کرد. بۆمبا هاوێژەکان نزمتر دەفڕین و بۆ هێرشێکی تر بە کاروانەکە جێگای خۆیان دەگۆڕی. ئەو دەبوایە تاوێک لە تاریکی و بێهۆشی تەواودا دانی بەخۆیدا بگرتایە، کە دەستڕێژەکە تاکو تەرابۆوە. ئەوان دەبوایە سەر لە نوێ تەقە بکەنەوە. هەمووتان پێکەوە .. ئەوەی ووت و هەوڵیدا هەستێتە سەرپێ. بەڵام ئێش و ئازار و بروسکەی قاچی دووبارە دایانەوە بەزەویدا. بۆ یەکەم جار سەیرێکی قاچی خۆی کرد. یەکێکیان ساغ و ئەویتریان لە ئەژنۆی بەردوخوار پەڕیبوو و تەنیا بەچەرمە پێستێکەوە مابۆوە. لەو کاتەدا تارمایی ئەو

سەربازەی شەڕی ((دین بین فو))ی بەبەرچاواندا ڕابوورد کە قاچی دەپەڕێ و هەردەشیەوێ بجەنگێ.
بێ وەستان کێردەکەی لە گیرفانی دەرهێناو بەسەری نووکەکەی قاچە بێ کەڵکەکەی لە خۆی جیا کردەوە. ئینجا کراسەکەی بەرخۆی دادڕی و برینەکەی پێ پێچاو بەسینگە خشێ بەرەو لای ئاواڵەکانی سەرەو ژوور کەوتە خزین: ((پێکەوە، پێکەوە تەقەیان لێ بکەن!)) تفەنگەکانیان یەک دەنگ تەقەیان لێ هەستا و دەنگی دەستڕێژیان کەوەڵامدانەوەی بانگەوازی فەرماندەکەیان بوو لە مەرەزەی برنجەکەوە دەنگی دایەوە.
فەرماندە بەو چاوانەی کەتا دەهات وورده وورده تاریک دەبوون یەکێک لە بۆمبا هاوێژەکانی دیت هەوڵی ئەوەیەتی خۆی لە باری هێرش و پەلاماردان ڕزگار بکات و بەرزبێتەوە ئەوا چەرە دووکەڵێکی ڕەشی لە دوواوە هەستاوە. لە پێشاوای هاتە بەرچاو کە ڕزگاری دەبێ، بەڵام دووکەڵە ڕەشەکە تا دەهات نزم تر و تێکەڵاو و پێکەڵاوتر دەبوو تا دای بەزەویدا. دوو فڕۆکەکەی تریش وەک هەڵۆی تەریو، بەرز بوونەوە و لە پشت کێوەکانەوە وون بوون. دووای ئەم شەڕە، کاتێ ئەوانی تر لاشەی فەرماندەکەیان دەنایە گۆڕەوە، دیتیان هێشتاکەش مەرگ نەیتوانیوە زەردەخەنەی پڕشانازی لە لێوی بسڕێتەوە یەکێکیان ووتی:
((ئەرێ مەبەستی چی بوو کە پێش مردنی هەرباسی مرواری و هەڵووژەی دەکرد؟))
ئوتومبێلچیەکی تر وەڵامی دایەوە: ((چرۆی هەڵووژە نیشانەی خۆشبەختییە.
ئەو برنجەی کە باریشمان کردووە لای ئەو لە مرواری بەنرختر بوو. ئێمە برنجەکەمان ڕزگار کرد و توانیشمان فڕۆکەیەک سەرنگون بکەین. دیارە مەبەستی ئەویش هەر ئەوە بوو)) و ئەوەی یەکەمیان ووتی:
((ڕاست دەکەی. ئەوە ئەو شتەیە کە مەبەستی ئەوبوو)).
((مینە توو)) کە مانای مرواریيە، ناوی کوڕێژگەیەکی بچکۆلانەیە.
((تویت مای)) کە مانای هەڵووژەیە. ئەویش ناوی کچۆڵەیەکی یەک ساڵانەیە.
دایکیان لە تەنیشت چرپاکەیانەوە ڕاوەستا بوو و کەوتبووە گێژاوی بیر و ئەندیشەوە. ناوی ((کیم)) و لە کچۆڵەیەکی بچوکتر دەنواند. ئەو بێوەژنی ئەفسەرێک بوو کە کاروانی برنجەکەی ڕزگار کردبوو. کیم نەیدەتوانی باوەڕبکات کە ئەویش بێوەژنێکە. هەندێ کەس شتێکیان دەربارەی مردنی مێردەکەی پێ ووتبوو،

بەڵام هیچ شتێکی ڕەسمی لەم بارەیەوە بڵاو نەکرابۆوە چونکە خەڵکی هەموو جۆرە قسەیەکی دەکەن، هەر بۆیەش ئەو نەیدەویست بەقسە و قسەڵۆکان باوەڕ بکات. بەڵام لە ناخی دەروون و بیری خۆشیدا دەیزانی کە خەڵکی لە خۆراباسی مردنی کەس ناکەن. ئەو لە کارخانەی قاڵی چنین دا ئیشی دەکرد و زۆریشی شانازی بەکارەکەیەوە دەکرد. دیارە پێشی خۆشتر بوو کە لە کارخانەیەکی گەورەی مافوور چنین دا کاری بکردایە بەڵام خۆ لە ((هایفۆنگ)) کارخانەی وا نەبوو. کە دەیدیت بەپەنجەکانی نموونەیەکی جوان دێنێتە بەرهەم زۆری دڵ پێدەکرایەوە و خۆی پێ هەڵدەنا. ئەو پەنجانەی کە چاپووکانە، لە ڕۆژێکدا شەش هەزار گرێیان دەچنی. ئەو نەیدەویست لەمە زیاتر خۆی ماندوو کات چونکە خێزانێکی گەورەشی بەملەوە بوو، کچۆڵەیەکی یەک ساڵانە و کوڕێکی سێ ساڵی و مێردو خەسووش. ئەو هەرگیز دڵی نەدەهات لە منداڵەکانی دابڕێت و دەیویست هەموو خێزانەکە وێکرا سەرپێکەوەنێن. چونکە پێکەوە بوونیان دەبووە هۆی هێز و توانایەکی زیاتر بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی تەنگوچەڵەمەی ژیان.

هەفتەیەک ڕابوورد. وەک مانگێک تێپەریبێ. ((کیم)) هەموو ڕۆژێ شەش هەزار گرێی هەر دەچنی و سەرپەرشتی منداڵەکانیشی دەکرد. بەڵام لە خۆی ڕانەدەدیت بچێتە لای ئەفسەری لێپرسراوی کاروانی دوورە ڕێ و سۆراغی مێردەکەی بکات کەچی لێ بەسەر هاتووە؟ مێردەکەی دەمێک بوو ڕۆیشتبوو بەڵام بەمە هیچ دڵگیرنەبوو چونکە ئەوانی تریش کە ڕۆیشتبوون کەسیان نەگەڕابوونەوە و ئەمەش یەکەمجار نەبوو. ئەو ڕێ یە، ڕێیەکی دوور و ترسناک بوو. ترسناک! نانا، کاروانێکی هاکەزایی بوو، کاروانی برنج. بەڵام قسەی خەڵکی. سەرەنجام بڕیاری خۆبدا و چووە لای ئەفسەری ناوبراو.

((مێردەکەتان لە ڕۆژی نۆزدەی فەورییە بەناوی قارەمانێک کوژرا. یەک قارەمان .. قارەمان .. قارەمان .. ڕۆژی نۆزدەهەم .. کوژرا))

ئەم ووشانە وەک کوتک. دڵ و مێشکیان کوتا و هەنیسکی گریانی لە گەروودا گیر بوو. تا ((هایفۆنگ)) سێ سەعات ڕێ یە، و لە تەواوی ئەو ماوەیەدا بێوەژنی شۆخ و شەنگ هەردەگریا. و سواربووانی ناو ئوتومبێلەکەش تەواوی هەوڵ و کۆششی خۆیان بەکار دەهێنا تا ئارامی بکەنەوە:-

((مێردەکەتان قارەمانێکە))

((هەر تەنیا تۆنیت. ئێوە یەکەمین بێوەژن نین و بەداخەوەش دوایین بێوەژن نابن))

((ئێمە دەبێ تۆڵە بستێنین))

خەڵکەکە دەدوان. کیم دەیبیست و نەیدەبیست و هەر لە دڵی خۆیدا لێکی دەدایەوە: قارەمان، یەک قارەمان. وا باشترە ئادەمیزاد وەک قارەمان بژیەت.
تەنیا کەسێک کە هەوڵی دڵدانەوەی ئەوی نەدەدا، پیرێژنێک بوو. کە بەڕوویەکی گرژو ترش و تاڵەوە تەماشای ((کیم))ی گریناوی دەکرد.
هەرجارێک کە کیم چاوی هەڵدێنا. چاوی بە چاوی ئەو پیرێژنە رووگرژومۆنە دەکەوت کەتێ ی ڕامابوو و ئەو تەماشاکردنە وای لێکرد کە تۆزێک خۆی کۆک بکاتەوە و بە نائومێدیەوە هەوڵی دەدا نەهێڵێ فرمێسکی بێنە خوارێ، بەڵام بێ سوود بوو. و ئەو لە پرمەی گریانی دەدایەوە. بەڵام تادەهات پیرێژن زیاتر مێشکی دادەگرت و زانی پیرێژن بەئەنقەست دەیەوێ چاوی لە چاوی ببڕێت و سەرنجی رابکێشێت. شادی، شادی باش ناناسێت. بەڵام غەم شتێکی ترە. غەم کە غەمی دیت زوو دەیناسێتەوە. کیم لە جێگاکەی خۆی هەستا و لە شوێنێکی نزیکتر لە پیرێژنەوە بێدەنگ دانیشت.
پرسی: ((ئایا ئێوەش غەمێکتان هەیە؟))
((هەفتەیەک لەمەوبەر دووکوڕ و، بووک وچوارنەوەم.))
((ئەوانیش هەموو قارەمانی جەنگ بوون؟))
((نەخێر، هەر کوڕەکانم قارەمانی جەنگ بوون، بەڵام نەوەکانم قوربانی بێ گوناە بوون و لە ماڵەوە بۆمبا کوشتنی)).
((کیم)) بێدەنگ بوو. غەمێکی گەورە بوو. غەمێکی خەست، لە هەموو شوێنێک. تەواوی نەفەرەکانی ئوتومبێلەکەش هەریەکە بەشی خۆیان لەو غەمەدا هەبوو. ئەو غەمە لەگەڵ ووشەی ((ئەمریکایی)) دا سەری لە هەموو ماڵە ڤێتنامییەک هەڵکردبوو. ئوتومبێلەکە گەیشتەوە ((هایفۆنگ))ی پرگڵۆپ و شەقامە قەڵەباڵغ و جەنجاڵەکانی ((کیم)) لە پڕ کەبەتەنیا لەناو ئەو هەموو پیاوانەی شاردا تەنیا دەمێنێتەوە و ناشزانێ بێوەژنێکە، هەستی بەترس کرد. بەڕەنگ و ڕواژایەکی کە لێوەی دیار بوو خۆی لە پیرێژن نزیک کردەوە و ووتی: ((نافەرمووی بچینەوە ماڵی خۆمان؟ پیرێژن وەڵامی دایەوە:
((تۆ بەڕێ ی خۆتدا دەڕۆی و من لێرە زیاتر نایەم منداڵەکانت چاوەڕێن. ئادەی، سەیرکە، دەمەوێ شتێکت بدەمێ» کتێبێکی بچکۆلەی لەجانتاکەی شانی کە لەچەند پارچە بڕشتێک دروست کرابوو دەرهێنا. «بگرە! من نیازم وابوو ئەوە بدەمە بووکەکەم، کە ئەویش بێوەژنە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لەتۆ بەهێزترو خۆڕاگرترە ئەو ەبخوێنەرەوە. دەزانی بخوێنیەوە؟))

((کیم)) بەنیشانەی ((ئا)) سەری بادا.
پیرێژن ووتی: ((بەڵام بیخوێنیەوه .. ئێ. له کاتێکا که بەدەنگێکی گڕ و ناخۆشەوه درێژەی بەقسەکانی دەدا: ((ووشه به ووشه بیخوێنەرەوەو ئەو کاته بڕیار بده که دەبێ چ بکەی))
((کیم)) بەساردییەکەوه کتێبەکەی وەرگرت
منداڵەکان له ماڵەوه خەویان لێ کەوتبوو. ((کیم)) بەلای چرپای منداڵەکانییەوه چوو، ((توبت مای)) و ((مینه توو)) یانی هەڵوورژەو مراورییەکەی. وێنەیەکی مێردەکەی لەسەر چرپاکه بوو. ڕایکرد، ناو باغەکه و دەستی به گریانێکی بەکوڵ کرد. نا، ئەو یەکەم بێوەژنی ڤێتنام نیه، دوایین بێوەژنیش نابێت. بەڵام ئەمه هیچی له باری غەمی ئەو سووک نەکرد. بەره بەری ڕژئاوابوو که هاتەوه ماڵێ. له تەنیشت منداڵەکانیەوه ڕاکشا. بەڵام کاتێ که خەریکی ڕێکخستنی پەتویەکه بوو لەسەر زەویەکه دەستی بەر شتێک کەوت. کتێبی پیرێژنەکه بوو. ئەو پیرێژنه بۆ هێنده سووربوو لەسەر ئەوەی که ((کیم)) ئەو کتێبه هەربخوێنێتەوه؟
دەیزانی که خەوی لێ ناکەوێ. لەبەر ئەمه هەستا چرایەکەی داگیرساندەوه و کتێبەکەی لێک کردەوه:
... ناوی ((نگوین وان تروی)) بوو. ((کیم)) زوو خاوەنی وێنەی ناو کتێبەکەی ناسییەوه. هەموو کەسێک ((نگوین وان تروی)) دەناسی ئەو قارەمانێکی میللی بوو.
بەڵام ((کیم)) نەیدەزانی ژنەکەی ناوی ((ڤان تی گوین))ه ئەو دەمەی تازه مانگێک بوو ببوونه هاوسەر، که ((نگوین و وان تروی)) له ڕێی ڕاپەڕینی بەرگری ژێرزەمینیەوه بۆ کارێکی زۆر پر تەلەزگه نێردرایه سایگۆن. ئەو نەگەڕایەوه، پۆلیس گرتیان و خستیانه بەندیخانەوه. ئەی ژنەکەی چی لێهات؟ و دووای ئەو چی کرد؟ بووکی مانگێک که هێشتا بەناوی مێردەکەی ڕانه هاتبوو؟
ئەو کتێبەی پیرێژنه مۆن و مرچەکه دابووی به ((کیم)) دەربارەی ((نگوین وان تروی)) بووکه ژنەکەی نوسیبووی. کاتێ ((کیم)) کتێبەکەی خوێندەوه، تێگەیشت که ((ڤان تی گوین)) چ ژنێکی لێدەرچوو. ئەو بوو بەشۆڕشگێڕێکی پۆلایین.
بەیانی ئەم ڕۆژه ((کیم)) زووتر بەرەو کارخانه ملی نا بڕیاریدا بچێته یەکیەتی لاوان. دەیزانی دەبێ چیان پێ بڵێ:
((من ئەو ماوەیه بیرم دەکردەوه. تەواوی مانگی پێشوو و بەتایبەتی دوێنێ شەو بیرم

کردۆتەوە قسەکەم پێ مەبڕن. هەموو شتێکتان پێدەڵێم. من تا ئێستا وەک پێویستە وانە ژیاوم. ڕۆژی شەش هەزار گرێ بەس نیە. نا، قسەم پێ مەبڕن. پێتان دەڵێم ئەوەی بیرم لێ کردۆتەوە ڕاستە. ئێمە دەبێ زیاتر و باشتر ئیش بکەین. ئەو گرێیانەی کە ئێمە لەو قاڵبیانەیان دەدەین و بۆ دەرەوە یان دەنێرین شتێکی ڕاستەقینەیە. کارێکی زۆر پرسوودە، و نیشتیمانەکەمان پێویستی پێیەتی. چونکە زێرمان بۆ دێنێتەوە. ئەو زێرەی کە هاوولاتیانمان بۆ کڕینی هەرچی بیانەوێ پێویستیان پێیەتی. هەروەها بەو زێرە دەتوانن نرخی ئەو گوللە تۆپانە بدەن کە فڕۆکەکانیان دەیانگەیەننە بەرەی شەڕ.

ڕاوەستن، ئارامتان بێ، لێم گەڕێن قسەکانم بکەم. من بڕیارم داوە تۆڵەی مەرگی مێردەکەم بستێنمەوە. ئەمڕۆ بڕیارم داوە هەشت هەزار گرێ بچنم، و دوایی هەوڵدەدەم بیگەیەنمە دە هەزار گرێ. ئەوە ئیشی منە. شتێکی تریش، ڕێم بدەن بچمە ناو هێزی بەرگریشەوە. فێری چەک بەکارهێنانیش دەبم. من دەمەوێ بۆ خۆم بەرگری لە منداڵەکانم و لە شارەکەم بکەم ... لە ڕاستیدا بەرگری لە هەموو ژیان و بوونمان. ئایا بەلای ئێوە شەوە ڕێگای ڕاستی ژیان هەر ئەمە نیە؟

ئەوانیش وەڵامیان دایەوەکە:

ڕێی ڕاستی ژیان، هەر ئەمەیە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو ئەم وەڵامەی ئەوانی بۆ پرسیارەکەی خۆی نەدەویست. سەر لە نوێ بەخۆیدا هاتەوە و هەمان پیرێژنی مۆن و مرچی نادیاری لە نزیک خۆیەوە هەست پێدەکرد. پیرێژنێک کەبووکەکەی ئەویش بێوەژنێک بوو، بەڵام بەهێزتر و خۆڕاگرتر لە ((کیم)) دەیویست بیسەلمێنێ کە ئەویش بەهێزە. خۆ ئەو هەرتەنیا بێوەژنێک نەبوو، بێوەژنی قارەمانێک بوو. لە ماڵەوە کوڕەکەی بەهەڵپەوە پێ ی ووت:

((دایە! ئوتومبێلەکان گەڕانەوە .. خۆ هەموو ئوتومبێلچیەکان دیارییان بۆ منداڵەکانیان هێناوە. ئەی بابە کەی دێتەوە و دیاریمان بۆ دێنێ؟))

((کیم)) دەستی نا بەدەمی خۆیەوە، تاقوڵپەی گریانەکەی بشارێتەوە. ک دەستی بەقسەکرد، دەنگی ساف و بێ گرێ و گۆڵ بوو: ((بابە هەرگیز نایەتەوە. ئەو لە پێناوی نیشتیماندا کوژرا. من جێ ی ئەوتان بۆ دەگرمەوە و جل و بەرگی جوان و شتی یاریتان بۆ دەکڕم. کوڕە بچکۆلانەکەی نا بەسینگیەوە و لەسەرخۆ ووتی: ((باوکتان کوژرا. ئێوە تەنیا دایکتان هەیە. ئێستا دەتانەوێ چبکەن؟))

((من تۆم خۆشدەوێ، کاتێ گەورەش بووم دەچمە ڕیزی گاردی نیشتیمانیەوە و وەک

باوکم دەبم))
((کیم)) بەدەنگێکی لەرزۆکەوە، ووتی: ((بەڵێ کورِم! وەکو باوکت بە .. ئازا و پیا و بەلاّم تۆ نابێ بمری، تەنانەت بەناوی قارەمانێکیشەوە. تۆ دەبێ تەمەنێکی درێژ بژیت.
با، بە ئومێد بین کاتێ کە تۆ گەورە دەبی شەڕ تەواو بووە.
من دەمەوێ تۆ خۆشبەخت و کامەران بیت و ئەگەر ویستیشت ببیە قارەمان، لە ئیش و کاردکانتدا قارەمان بە.
((کیم)) لە ((هایفۆنگ)) دا دەژی. ساڵێک بەسەر مەرگی مێردەکەیدا تێپەڕیوە، خەڵکی دەڵێن کە ئەو زۆر گۆڕاوە. پێیان ووتم کە ئەو زۆر بیدەنگ و کەم دووە. هەروەک ئەمڕۆ بێت ئەوم ناسیبەوە کارگەرێکی تێکۆشەر و ئازا، تفەنگچیەکی لێهاتوو لە هێزی بەرگری، قوتابی پۆلی پێنجەمی یەکێک لە قوتابخانەکانی شەوانە و دایکێکی دڵسۆز. بلووزێکی سپی قوڵ درێژ و چاکەتێکی شینی قۆپچە بریقەدار لەبەر و نیشانەیەک بەیەخەوە کە سەر کۆمار بۆ خۆی پێشکەشی کردووە. قژە درێژەکانی بە ڕەفتەیەکی سپی بەسترابوون، کە نموونەی پاکی و شۆخی یە. ((کیم)) هەرگیز ئەوەی بەبیردا نەدەهات کە جارێکی تر ڕەفتەی سپی لەسەر دەبەستێتەوە. ڕاستی ئەوەبوو کە ئەمجارە نەک وەک بێوەژنێک بەڵکە وەک شۆڕشگێڕێک لە هێزی بەرگری میللی لە ((هایفونگ))دا ڕەفتەی سپی بەستبوو.

---

لە نامیلکەی - صدا - ی فارسییەوە وەرگێڕدراوە
لە گۆڤاری ((بەیان))ی ژمارە - ٧٩ - ی مانگی مایسی ساڵی ((١٩٨٢))دا بلاّوکراوەتەوە.

ناوەندی هەفتــە بوو کـوڕە لاوێک لەبەر نەخـۆشـخـانەی، دەروونی، قــووت بۆوەو بەدەرگاوانەکەی ووت:

- دەمەوێ یوسفەفەندی ببینم.
- کام یوسفەفەندی؟
- خەڵکی ((مەجیر ئاوای خوارووە.
- لەکام بەشدا ئیش دەکات؟
- ئیش ناکات. نەخۆشە، دوو مانگ لەمەوپێش هێناویانەتە ئێرە.
- لە ڕۆژی سەردانا وەرە ئەمڕۆ نابێ قەدەغەیە!
- دەکرێ بچمە لای سەرۆکی نەخۆشخانە و مۆڵەتی لێ وەربگرم؟
- سەرۆک ئیشی هەیە.
- دەکرێ پزیشکی ئێشکچی ببینم؟

دەرگاوانەکە پەنجەی بۆ دووسێ کەسی بەرگ سپی کە لە ژێر درەختەکاندا دانیشتبوون ڕاداشت:

ئا ئەوانەن .. لەوێن ..

کوڕە لاوەکە چووە لای پزیشکەکان، سڵاوی کرد و ووتی:

- من مامۆستای ((مەجیر ئاوا))م یەکێکیان لە دێیەکەی ئێمەوە هێناوەتە ئێرە .. ناوی یوسـفـەفـەندی یە .. لەبەر ئەوەی مـاوەی مـانەوەم تەواو بووە و دەبێ ئەمشـەو هەربگەڕێمەوە، ناتوانم تا ڕۆژی سەردان ڕاوەستم .. دەکرێ بفەرموون ئەمڕۆ ببیبینم؟

یەکێ لە پزیشکەکان ووتی:

- فەرموون دانیشن.

پزیشکە تەنگەستوردەکە پرسی: خزمتانە؟

- نەخێر، من خەڵکی ئەو دێ یە نیم، دوو ساڵ لەوێ مامۆستا بووم.

سێهەم پزیشکیان کەموو ڕەشێک بوو ووتی:

- ناسیم .. ئەوە نی یە دەمووچاوێکی سوورفلی هەیە و تەمەنی لە دەوروبەری پەنجا شەست ساڵێکدایە؟

- بەڵێ خۆبەتی .. شەست و حەوت ساڵە بەڵام جحێڵ تر دێتە بەرچاو.
- لەبەشی منە .. ئێستا کاتی نان خواردنە .. ڕاوەستە بالێ بینەوە بانگی دەکەم.

مامۆستای لاو پرسی:
- نەخۆشیەکەی چیە؟
نەخۆشی دەرونی - نەفسی - هەیە، هەموو دەمێ لەگەڵ خۆی دەڵێ:
پزیشکە تەنگەستوورەکە پرسی:
- چ دەڵێ؟
- هەمیشە قسێکی دووپات دەکاتەوە: ((چاک دەبێ ئیشاڵڵا)).
مامۆستاکە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، چاوی پڕ بوون لە ئاو ووتی:
- ئێستا تێگەیشتم، یوسفەفەندی بێچارە بۆ نەخۆش بووە.
پزیشکەموو ڕەشەکە پرسی:
- دەردێکی هەیە؟
- بەڵێ دەردێکی گەورە، دەردی تەواوی خەڵکی مەجیر ئاوا .. تەنانەت دەردی منیش!
پزیشکەکە بەڕاشکاوییەکی زیاترەوە ووتی:
- ئەگەر بفەرموون دەردەکەی بڵێین لەوانەیە بۆ چارەسەرکردنیشی سوودبەخش بێت..
مامۆستاکە دووبارە هەناسەیەکی تری قووڵتری هەڵکێشایەوە:
- بەچاوان، دەیڵێم. بەڵکە سوود بەخش بێت. دوو ساڵ لەمەوبەر بەمامۆستایی چوومە دێی ((مەجیر ئاوای خواروو)) دەوروبەری هەشتا ماڵێک دەبوو، شوێنێک کەناویان نابوو قوتابخانە، ژوورێکی گڵ بوو کە هەم جێگای نووستن و هەم جێ ی چێشت لێنانم و هەم پۆلی خوێندنیش بوو. پێش من مامۆستایان نەبوو.. هەر لەو دەمەیدا کە بیرم دەکردەوە چ بکەم سەر و کەللەی یوسفەفەندی پەیدا بوو ..
ئەو خەڵکی ((مەجیرا ئاوا)) بوو بەڵام چواردە پازدە ساڵ بوو چوو بووە ئەستەمبۆڵ و لەوێ سەرگەرمی ئیش کردن بوو بوو .. دوایی کەوەختی سەربازی دێت، دەچێتە سەربازی، کە سەربازی تەواو دەکات ماوەیەک لە ناو کەشتییاندا دەست بەکار دەبێت .. بەکەشتی تەواوی دنیا دەگەڕێت و دەبینێ، سێ زمانی بێگانان فێر دەبێ و چەند ساڵێک لە فەرانسە و بەریتانیا و سوێد دەمێنێتەوە .. دوای تەمەنی چل ساڵی دەچێتە ئەمەریکا و لەوێ نیشتەجێ دەبێ پارە و پولێکی زۆر پەیدا دەکا ..
هێندەی هەبوو کە دەیتوانی دێی مەجیر ئاوا بەخانوو وبەردو ئاژەڵیەوە بکڕێت ..
بەڵام ئەویش دەردەکەی ئێمەی هەبوو .. دەردی نیشتیمان، لەگەڵ ئەو هەموو دەست کەو

ت و خۆشگوزەرانییەش، هەر لە بیری ئەوەدا دەبێ کە زووتر بگەڕێتەوە نیشتیمانەکەی، تەنانەت ژنیشی نەهێنابوو ڕۆژی ژماردوون تا بێتەوە و کچێکی مەجیر ئاوایی بێنێ. کاتێ هاتەوە کەس نەیناسیەوە دوایی کەناسیشیانەوە خزم و کەسەکانی زۆر ناراحەت بوون، وایاندەزانی هاتۆتەوە میراتی بابی وەرگرێتەوە. بەڵام یوسفەفەندی هێندەی پارە و پول هەبوو کە هەرگیز لە بیری ئەم شتانەدانەبوو، ئەو تەنانەت ئامادە بوو پارەو پوولەکانیشی هەموو خەرج بکات تا ((مەجیر ئاوا)) وەکو دێهاتەکانی ئەمەریکای لێ بێ.

منیش بەهاتنی ئەو بۆ دێیەکە زۆر شاد و دڵخۆش بووم، نە لەبەر ئەوەی سوودێکم پێ بگات و پارەو ماردیەکم دەست کەوێ! نە .. لەبەرئەوە بوو کە ئەو پیاوێکی ڕۆشنبیر و تێگەیشتوو بوو لە یەکەم چاو پێک کەوتنماندا لێی پرسیم:

((قوتابخانەکەتان چەند قوتابی هەیە؟))

- ((هیچ، هەرچیەک دەکەم و دەکۆشم کەس منداڵەکەی نانێرێ!))

یوسفەفەندی زۆری پێ ناخۆش بوو و ووتی:

وەرە دەست لە ناو دەست نێین و دێیەکە ئاوەدان کەینەوە.

ووتم:

((من لە خوام دەوێ))

دەستی گرتم و ووتی:

((یاڵڵا هەستە بابچینە چایخانەکەو لەگەڵ دێهاتییەکاندا بدوێین». دووبەدوو چووینە ژووری چایخانەکە، زۆربەی پیاوەکانی دێ لەوێ بوون. یوسفە فەندی لەنزیک «کاک مراد»دوە دانیشت و دەستی بە باسکردنی سوود و قازانجی خوێندن و فێربوون کرد، هەر وتی .. وتی و ... وتی.. تاله دواییدا ووتی:

((منداڵەکانتان بنێرنە قوتابخانە بابخوێنن))، کەس وورتەی لێ نەهات هیچیان یەک.

((بەڵێ)) یا ((نا)) یان لە زاری نەهاتە دەرێ.

یوسفەفەندی دووبارە دەستی بەپێدا هەڵدان و سوود و قازانجی خوێندن کردەوە ..

من تەماشایەکی سەرو چاوی ((کاک مراد))م کرد دیتم چاوە خەواڵوودکانی خەریکی نووقانن ..

یوسفەفەندی بەدەنگێکی بەرز پرسی:

- باشە، براینە دەڵێن چی؟ وەڵام بدەنەوە!

دیسانەوە کەسێ دەنگی لێ نەهات.
یوسفەفەندی ڕووی لە کاک مراد کرد، تۆ دەڵێی چی؟
کاک مراد تۆزێک چاوەکانی هەڵگلۆفی و وەڵامی دایەوە:
((چاک دەبێ ئیشاڵڵا)).
یوسفەفەندی کەمێ جووڵا:
- چ چاک دەبێ کاک مراد؟ دەبێ قوتابخانەکە گەورەکەین، پۆلەکانی زیادکەین، ژووریکی بۆ مامۆستای دروست کەین .. من پارەکەی دەدەم، ئێوە تەنیا ئیش بکەن.
باشە دەڵێن چی؟
دیسانەوە دەنگ نەبوو. ئەمجارە ڕووی کردە ((مام خدر))ی چاپچی و ووتی:
- ها مام خدر تۆ دەڵێ ی چی؟
مام خدریش کە لە سەر سەکۆی چایخانەکە پاڵی دابۆوە و خەریکی وەنەوزدان بوو تەکانێکی دا و ووتی:
- بڵێم چی قوربان؟ ((چاک دەبێ ئیشاڵڵا)).
بەدڵ شکاوییەوە لە چایخانەکە هاتینە دەرێ، ووتم
- بابچینە ماڵی کوێخا، ئەو کۆمەکێکمان هەر پێدەکات.
لە ماڵی کوێخاش، یوسفەفەندی تەواوی ئەو قسانەی کەلە چایخانەکەدا کردبوونی، دووپاتی کردنەوە .. کوێخا هەروا کە گوێی کلۆر کردبوو چاوەکانی سیس ببون و دەستی بەوەنەوزدان کرد.
کاتێ قسەکانی یوسفەفەندی تەواو بوو ووتی:
غەمێ مەخۆ، ((چاک دەبێ ئیشاڵڵا)).
ئەویش هەستاین، ووتم:
- یوسفەفەندی چ بکەین؟
- نابێ شل بین، من ئامادەم بە پارەی خۆم قوتابخانەکە درووستکەم!
یوسفە فەندی گەچ و لم و چیمەنتۆ و دار و تەختە و ئەوەی بۆ خانوو دروستکردن پێویست بێت هێنای و لەبەردەمی قوتابخانەکەی هەڵڕشتن ((موسا درێژ)) کە کەمێکی سەر لە وەستایی یە دەردەچوو لەگەڵ پێنج کرێکاردا بەکرێ ی گرتن، بەڵام ئیشەکە هیچ بەرەو پێش نەدەچوو، دوو مانگ تێپەڕی دیوارەکان مەترێک بڵند بوو بوون. هەر چەند یوسفەفەندی داد و بڕۆو هات و هاواری دەکرد موسا درێژ زۆر لەسەرخۆ و ئارام وەڵامی

دەدایەوە:
((تەواو دەبێ ئیشاڵڵا)).
بەهەر کوێرەوەرییەک بوو خانووی قوتابخانەکە تەواو بوو.
بەڵام تازە سەرەتای بەدبەختی بوو، تەنگوچەڵەمەی گەورە، پەیداکردنی قوتابی بوو بۆ قوتابخانەکە بەهەزار ناڵی عەلی شازدە قوتابیمان پەیدا کرد.
ڕۆژێکیان هەموومان لە چایخانەکە دانیشتبووین کە لە پڕ ((موسا درێژ)) هاتە ژووری، زۆر ناراحەت و شڵەژاو بوو بەدەنگێکی لەرزۆکەوە ووتی:
- کوڕینە، فریام کەون گایەکەم خەریکە دەمرێ.
کەس وەڵامی نەدایەوە، چووە لای کاک مراد و بەپاڕانەوەوە ووتی:
- کاک مراد .. بیرێکی بکەوە .. ئەو بەستەزمانە خەریکە دەمرێ.
لێوەکانی کاک مراد جووڵان:
((چاک دەبێ ئیشاڵڵا)).
موسا درێژ ڕووی لە مام خدری چایچی کرد.
تۆ داوودەرمانێکی پەیدا کە، گایەکەم خەریکە لە دەست دەچێ.
((ناراحەت مەبە، چاک دەبێ ئیشاڵڵا)).
موسا درێژ چەند فەریکە جنێوێکی بەهەمووان داو لە چایخانەکە وەدەرکەوت.
من و یوسفە فەندیش هەموو شەوێ خەریکی قسان و گرفتاری چ بکەین و چ نەکەینی خۆمان بووین. شەوێکیان لە هات و هاواری خەڵکی لە خەو ڕاپەڕیم! دەنگ و هاوار لە چایخانەکەوە دەهات، جلەکانم لەبەرکرد و دەرپەڕیم تابزانم چ باسە .. خدری چایچی خەریکی لە خۆدانێ بوو و دەگریا ، کوڕی کوێخای کچەکەی هەڵگرتبوو و ئابڕووی چوو بوو .. دەیقیژاند:
((خەڵکینە فریام کەون .. ئابرووم چوو .. لەو تەمەنەیدا ڕیسوا بووم)).
کاک مراد ئارام و لە سەرخۆ پێ ی ووت:
مام خدر ئارامت بێ ((چاک دەبێ ئیشاڵڵا))
مام خدر هێندە ناراحەت بوو زاری کەفی کردبوو و هەرجنێوی دەدا.
بەیانی ئەم باسەم بۆ یوسفەفەندی گێڕایەوە، ووتی:
ئەوانە کە بەڵایان بەسەرهات بە ئاگادێنەوە، بەڵام بۆ بەیانی لەبیریان دەچێتەوە. ڕاستیشی دەکرد خەڵکی مەجیر ئاوا ئەگەر ڕۆژی پێنج جاریان دەم کردبایەوە هەر پێنج

جارەکەی بۆ ئەوە بوو کە بڵێین: ((چاک دەبێ ئیشاڵڵا))، وا ڕێکەوت ئەو شەوە یوسفەفەندی هاتە ماڵی ئێمە و دوای کوڵێک دەردە دڵ هەڵڕشتن ووتی:

- سەرەنجامی حاڵی ئەو خەڵکە بەچی دەگات؟

هەر لەگەڵ ئەو قسەی کرد لە پڕ لە زارم دەرپەڕی و ووتم:

((چاک دەبێ ئیشاڵڵا))

یوسفەفەندی بێچارە لە توورەییانا ڕەنگی ڕەش داگەڕا و قیژاندی:

- مامۆستا گیان، تۆش هەر ئەو قسەیە دەکەی!

بەشەرمێکەوە ووتم:

بەخوا بەدەست خۆم نەبوو، لە زارم دەرپەڕی!

ماوەیەکی تریش ڕابورد .. ڕۆژێکیان زانیمان کە دزچۆتە سەرماڵی مەلای گوندی و کەل و پەلەکەی بردووە، هەستام چوومە لای تا بزانم چ باسە!

مامۆستا هێندە ناراحەت بوو بوو زۆری نەمابوو بگریێ، ووتی:

کام فەرمەسۆنێکە بەخۆی ڕاپەڕمووە ماڵی من بەرێ؟!

دەنگ لە کەسەوە نەهات ((مامۆستا هێندەی دیکە تووڕەبوو و هاواری کرد:

وەڵام دەنەوە، بابە .. کێ دەتوانێ ئەو کارە بکات؟

کوێخا بەسەری لووتی ووتی:

- بڵێم چی قوربان .. هەرچی بیلێم بێ سوود و بێ هودەیە، ((چاک دەبێ ئیشاڵڵا))

مامۆستا تادەمی هێنای تفێکی ئاوداری لە کوێخا کرد!

- کورە چ دەڵێ ی .. ئەمەش چا بوونی هەیە؟!

ڕۆژبەڕۆژ حاڵ و باڵ خراپتر دەبوو .. هەر شتێک کەبەسەر یەکێک هاتبایە لە جیاتی ئەوەی بیرێکی لێ بکەنەوە بەیەک ((چاک دەبێ ئیشاڵڵا پینەیان دەکرد، ڕۆژێک نیوەڕۆ خەریک بووم بەلای قوتابخانەکەدا تێدەپەڕیم، بەردێکم وەسەری کەوت و خوێن هاتە خوارێ .. چوومە لای یوسفەفەندی و پێم ووت:

- من ئیتر لەم ئاواییە نابم .. ئەفسووس بۆ ئەو ماندوو بوونەی پیاو بۆ ئەم خەڵکەی بکێشێ.

یوسفەفەندی هەروا کەسەری بەردابۆوە و خەریکی وەنەوزدان بوو وەڵامی دایەوە:

غەمێ مەخۆ، ((چاک دەبێ ئیشاڵڵا))

هێندەم ڕق هەستا هەر ئەو ڕۆژە لە مەجیرئاوا ڕۆیشتم و .. ئێستا ئەوە دوومانگە لە

نەستەمبوڵم .. دوێنێ بیستم کەیوسفەفەندییان هێناوەتە ئێرە. پزیشکە تەنگەستوورەکە ووتی:

- وای .. وای .. بێچارە ڕاوەستە بانگی کەم بێت ...

دوای چەند دەقیقەیەک .. دووپەرستار، پیرە مێردێکیان هێنا هەرکە مامۆستا دیتی، بەدەنگێکی لەرزۆکەوە ووتی:

- سلاو .. یوسفەفەندی ..

یوسفەفەندی بە ڕوویەکی ماتەوە تەماشایەکی مامۆستاکەی کرد و لێوەکانی جوولاند:

((چاک دەبێ ئیشاڵڵا))

مامۆستاکە پرسی:

یوسفەفەندی دەمناسی؟

یوسفەفەندی دیسانەوە دووپاتی کردووە:

((چاک دەبێ ئیشاڵڵا))

چاوی مامۆستا پڕ بوون لە ئاو و پرسی: یوسفەفەندی چۆنی؟

- ((چاک دەبێ ئیشاڵڵا)).

پەرستارەکان بەڕاکێشان بردیانەوە جێگاکەی خۆی، مامۆستاکە زۆر سوپاسی پزیشکەکانی کرد و پرسی: ئایا چاک دەبێتەوە؟

هەرسێ پزیشکەکان بەیەکەوە ووتیان:

((چاک دەبێ ئیشاڵڵا)).

---

لە کتێبی ((ادمهای عوصی))یەوە وەرگیراوە و لە فارسییەوە کراوە بە کوردی

+ لە پاشکۆی ڕۆژنامەی عێراق ژمارە - ٣٤ - ی شوباتی ساڵی (١٩٨٠) دا بلاوکراوەتەوە.

یۆحـەنـنا باوکی سێ منداڵان و ئەمـیـنداری صندوقی یەک لە نەخـۆشـخـانەکـان بوو، موچەکەی بەشی نەدەکردو کورتی دێنا، لەگەڵ ئەوەشدا کە دراوێکی زۆری بەبەرچاو و نێو پەنجەکانیـدا هات و چۆیان بوو، بەڵام هەرگیز ڕۆژێک هەستی بەوە نەکردبوو کە ئەو هەموو ڕێز و خۆشەویستییەی ئەو لەو دراوانەی دەنێ، ئەوانیش بۆ ئەو وابن. ئەو لەو دیو پەنجەرە بچکۆلەکەیەوە دەتگوت فـرۆشـیـاری ئەو کـەل و پەلە بریقـەدارانەیە کـە حـەز و ئارەزوویان دەبزاوت و نرخەکانیشیان تەنیا ناهو هەناسەی سارد و غەم و حەسرەت بوون.

هەرچەند نەداریش هەمیشە وەکو بۆنی دەرمان و وێنەی ساقۆ سپییەکان بە ڕاڕەوە دوور و درێژەکـانـدا دەهاتن و دەچوون و دەورەیان دابوو و لێ ی جـودا نەدەبوونەوە، بەڵام هەرچی ماندوێتی و شەکەتی ئیشی ڕۆژانەی هەبوو بەو پێکەنینە پاک و بێگەردەی کـە لە دەمی ((ئەنجـە))ی ژنیـەوە دەهاتە دەرێ و پێشـوازی پێ لێـدەکـرد، سـەرەڕای هات و هاوار و بزێوی منداڵەکانیشی هەر هەمووی لەبیر دەچۆوە و ئەو ڕۆژە تائێوارێ هەرشاد و شەنگوڵ و بەختەوەر بوو.

ئەو تەنکە شەرمەی ڕەنگ و ڕواڵەتی ((ئەنجە))ش بەتایبەتی هەموو سەری مانگان کە مووچە پێش وەخت دابەشکراوەکەی بەسەر خەرجی ماڵێدا لێوەر دەگرت یەکجار زۆر شاد و دڵخۆش تری دەکرد. بەڵام ئەمڕۆ پێنج مارکی دایە، ئەنجەبەسـەر سامییەوە لێیان وورد بۆوە و بەترسەوە تێ ی ڕوانین، تەنانەت ئەویشی لەو ترسەی خۆی گەیاند.

بەژنەکەی گوت: ((ئەمڕۆ ڕۆژی ساڵ بازاڕە، هەموو منداڵان دەچنە بازاڕی، دەبێ ئەوانەی ئێمەش بچن))

گوتی: ((بەڵێ))

لەسەرخۆ قسەکەی پێ بڕی: ((شتێکم فرۆشتووە و ئەم پێنج مارکەم پەیدا کردووە.))

لەڕاستیدا ئەو پێنج مارکەی لە صندوقی نەخۆشخانەکە دەرێنا بوو. وادەی وابوو خۆێنیان پێ بفرۆشێ، بۆ ئەمەش ڕۆژی دووشەممە یان بۆ خوێن لێگرتنی دیاری کردبوو، ئەویش بۆ ئەوەی منداڵەکانی هەلی چوونە ساڵ بازاڕیان لە کیس نەچێ ئەو پێنج مارکە لە صندوقەکە دەردێنێ. خۆ ئەگەر لە بیری بەختـیـاری و دڵخۆشکردنی منداڵەکانیـدا نەبووایە بەتایبەتی ئەویەک شەممەیە هەرگیز بە خەیاڵیدا نەدەهات کاری وابکا. ژنەکەی لێ ی نەپرسی چی فرۆشتووە تا ئەو پارەیە پەیدا کا، چونکە هەستی بەشانازییە کرد لە خۆیدا هەرچەندە ئەو هەستەش لە چەند کاتژمێرێکەکی کەمی بەولاوە نەخایاند. بەرامبەری ڕاوەستا و هەردوو

چاوی نانە ســــەریەک، پێ ی وابوو بەو هەندە دراوە زیوانەی لە نێــــو پەنجــــە باریکەڵەکانیدایە، کەوتۆتە ژیانێکی ئاسوودە و تا خوا حەزکا دەوڵەمەندانە.

دەمەو خوراوا ژنەکە لەگەڵ منداڵەکان وە دەرکەوتن و ئەویان بەخۆی و ڕۆژنامەکەیەوە لەسەر لاتەختەکەی ماڵێ بەجێهێشت. زانی کە زۆری شایی بەخۆیەتی و بەوەندە بەختیاربیەی بۆی ئەنجامداون زۆر دڵخۆشەو بۆیەش ڕۆژنامەکەی بە ڕووی خۆیەوە ناوە.

ئەنجە تەنانەت شەیدای ئەو ساتە وەختە لاوازانەشی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئیمڕۆ لێ ی بە گومان بوو هەستی دەکرد شتێکی لێ شاردۆتەوە و پێ ی ناڵێ و ناشیەوێ بیدرکێنێ بەڵام هەر خۆشییەکی حەزیان لێبوو کردیان و کەف و کوڵی دڵی خۆیان ڕشت. تێر سواری جۆلانەبای ((کارۆسیل)) و ئەسپە دارینەکان بوون و تاوەڕەز بوون ((ئایس کرێم)) یان لستەوە. دایکەکەش سەری لە خۆی سورمابوو کە لەگەڵ منداڵەکاندا یاری دەکات و نیشانە دەنێتەوە و تفەنگان داوێ. سەر و شەپقەیەکی لێو پانیشی بۆ کرین. وێکراش گوێیان لە دەنگی ژەنینی ئۆرگۆن گرت و چوونە سەیری لیبوکانیش.

بەڵام لە پڕ ژانێک دڵی گوشی، هەمان ئەو ژانەی کە بەلێوەکانیەوە دیاربوو و دەیویست بە ڕۆژنامەکە بیانشارێتەوە.

سەر لە نوێ کەوتەوە بیری بەفێرۆدان و بەم لاولا دادانی ئەو پارەو پوولانەی وردە بە «ئایس کرێم» و نیشان نانەوەو سوار سوارێنی ئەسپەدارینەو جۆلانە بانەدەمان، بەڵام ئەوەی ئازاری دەدا ئەوشتانە نەبوون. شتێکی دیکەبوو، ئەوان بەیانی جگە لەتۆزێک نان و نقیشک بەولاوە هیچی دیکەیان نەخواردبوو و ئەوەی لەهەموانیش چووکەڵەتر بوو پێخواست بوو و پێڵاوی دەویست.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەوەی دڵە خوتەی پێ خستبوو شتێکی دی بوو.

شتێک بوو نەیدەزانی چیە و پەی پێنە دەبرد. لەوانەیە هەر ئەو نرخی ئەو شتانە بزانێ کە ئێستا گەلان گێدانی پێدەکەن. وایدەزانی پارچەی لەشی ئەو لێدەکەنەوە و بیبڕەو و بەوێ ی دادەدەن. سەرێکی ڕاوەشاند و دەستێکی بەقژیدا هێنا. لەسەر وچاوی کابرای ئیشی بە جۆلانەبایەک دەکرد، کەجلێکی چەوراوی لەبەربوو ڕاما. ئاگای لە خۆی نەبوو، تادیتی ئەوە کابرا بۆی دەخنێتەوە و ووردە ئاماژانیشی بۆ دەکا.

ڕوی لێ وەرگێراو لەگەڵ منداڵەکان ڕۆیشت، چی ووردە یەکی پێ ی مابوو دوافلسی دایە منداڵەکان و لە گاریی ماسی فرۆشەکە نزیک بۆوە. بۆنی گارییەکە لە خۆبەوەی پێچا. وەک کیژۆڵەیەکی زبندانی دەنگی تا دەهات نزمتر دەبۆوە و بەدەم و دوێکی تێکەڵ

و پێکەڵەوە پرسیارەکانی کابرای دووپات دەکردنەوە و بەبێ ئەوەش بزانێ بۆ ..! یا هۆی چیە؟

وەک بەپلیکانان هەڵگەڕێ وورده وورده تا دەهات شل و بێ هێـــز دەبوو و لەشی دادەهێزرا. ئەو بەو حاڵەوە منداڵەکانیشی هەموو بەدەستی بەتاڵ هاتنەوە.

هەرهیـچـیـان پێنەمـابوو، بەبێ ئەوەی گـوێش بدەنێ، دەسـتـە بچکۆلانەکـانیـان لە گیرفانەکانیان دەگێڕا و پێشانی دایکیان دەدا کە هیچیان پێنەماوە. ماسی فرۆشەکە. بەدەنگێکی بەرز بانگی یەکێکیانی کرد و بە زەردەخەنەیەکەوە مارکێکی دایە ئەوەی لە هەمووان چووکەڵەتر و گوتی:

- ((مام پیاو .. بەشی برایەکانیشت بدە!))

خاتوو ئەنجە سەیرێکی پارەکەی نێو دەستی کوریژگەکەی کرد، ڕقی هەستا و بێ ئاگایانە پڕی دایە دەسـتی منداڵەکـە و مـارکـەکـەی لە دەست دەرێنا، دڵگرانی پیـاوێکی ڕژدو چاوچنۆکی بەڕوویەوە دیار بوو خێرا گوتی:

- ((بۆت هەڵدەگرم. با ئەوە بمێنێ. زۆرمان خەرج کردووە.))

وەک بەزمانی ژنێکی دی بدوێ. کە هەست و نەست و هەڵس و کەوتیان لێکتر جودا بێ و هیچ پەیوەندییەکـیـان پێکەوە نەبێ. کەدیتی کـابرای مـاسی ی فـرۆش تێ ی ڕامـاوە، تەریق بۆوە و وەک ئەوەی یەکەمـجـار بێ بیـبـینێ، ئەو هەسـتـە سـەیرەی لە هەمـوو لەشی گەڕا، هەروەها لە بەرامبەر کوریژگەکەی خۆشیدا کە ژانێکی لە ڕوودا بەدی دەکراو بەدڵ شکاوییەوە ڕووی خۆی وەرگێڕا، شەرم گرتی و تەریق بۆوە.

لە خۆی پرسی: ((ئەوە دەترسم؟ لەچی؟)) هەر بەو خـێـراییـەی مارکەکەی پێ لە دەست منداڵەکە دەرێنابوو، وەک بەسـەر تاوانێکەوە گـیـرابێ، هەر بەو خـێـراییـەش مـارکـەکـەی دایەوە .. منداڵەکە پارەکەی وەرگرتەوە، هەڵات و دوورکەوتەوە.

مـاسی فرۆش پڕ بەدڵ پێکەنی، ئەنجە بەبێ ئەوەی بزانێ بۆ؟ ڕقی لێ ی هەستا، کابرای بەجێهێشت و وە دووی کوریژگەکە کەوت، لە ڕاکردنیدا پارەکەی لە دەست پەڕییە ناوگیاو گۆڵەکە، بێ ترس سەیرێکی دایکی کرد، دیتی ئەوا داهاتۆتەوە و قـامکان لە نێو گژو گیا پێـخوسـتـەکە دەگێـڕێ و شـێـتـانە لە پارەکە دەگەڕێ و منداڵەکـەش زۆر بە وورياییـەوە تێیدەڕوانێ، دەستی لە گەڕانێ هەڵگرت و بە ڕوو گرژییەکی توندەوە کەوتە سەرزەنشتی کوریژگەکە و بەددان لە چیرەوە بردنێوە گوتی:

- ((ئەگەر لێ ی گەڕابای بەمن بایە!))

له گه‌ڕانه‌وه‌دیاندا گژوگیا پێ خوسته‌كانی به‌ختیاری ئه‌ویان تێدا بزربوو، له‌گه‌ڵ مۆسیقا و هات و هاواری منداڵه‌كان هه‌موو تێكرا پێكه‌وه له گوێیدا ده‌زرنگانه‌وه.
له ژووری كه‌وته جنێودانی مێرده‌كه‌ی. ده‌ست بڵاوه و ده‌یه‌وێ منداڵه‌كانیش فێری ده‌ست بڵاوی بكات به‌هیچ و خۆرایی منداڵه‌كانی ده‌نێرێته ساڵ بازاڕ و ئه‌و هه‌موو پاره و پووله‌شیان ده‌داتێ.
به‌ڵام یۆحه‌ننا هه‌ر نه‌یویست ئه‌و نهێنیه بدركێنێ و نه‌شی گوت ڕۆژی داهاتوو نرخی به‌ختیاری و خۆشی ئه‌و ڕۆژه‌ی منداڵه‌كان ده‌دات. ویستی به‌رگری له خۆی بكات، به‌ڵام بۆی نه‌هات، شتێكی وه‌ك، به‌ختیاری، یان جوان ژیانی، له ده‌می ڕاهات، به‌ڵام له‌گه‌ڵ هه‌موو ئه‌مانه‌شدا كه‌ڕق و تووڕه‌ییه‌كه‌ی ((ئه‌نجه))ش بوو به بانگ و سه‌ڵای گریان، ئه‌ویش هه‌ر له نهێنی ئه‌و گریانه‌ی ئه‌و نه‌گه‌یشت.

---

له كتێبی ((لیله فی فندق))ه‌وه، وه‌رگێڕدراوه. كه تارق حیدر العانی له ئه‌ڵمانییه‌وه كردوویه‌تی به عه‌ره‌بی. - / ٢ / ١٩٩٨ داره‌توو

## نووسینی/ عەزیز نەسین

کاروکاسبی کاکە حمەد زۆر لە برە و دابوو..
ئیشەکەی کڕین و فرۆشتنی گەنم و جۆ و کا و پۆلکە بوو، لەگەڵ ئەو هەموو دەست کەوت و سامانەشیدا، هەموو شتێکی بەحیساب بوو و تەنانەت ((تاکە فلسێک))یشی بەخۆڕایی و بەبێ جێ خەرج نەدەکرد .. ڕۆژێکیان ژنەکەی ووتی:
- پێڵاوی کوڕەکەمان دڕاوە .. جووتێک پێڵاوی توند و تۆڵی بۆ بکرە .. کاکە حمەد تووڕە بوو و وەڵامی دایەوە:
- کاتێ لەتەمەنی ئەودا بووم بەدووسێ ساڵ جارێک جووتە پێڵاوێکیان بۆ دەکڕین .. جاری واش دەبوو جووتە پێڵاوێکم پێنج ساڵان لەپێ دەکرد .. ئەو هەتیوە چیەتی وا هێندە زوو زوو پێڵاوان دەدڕێنێ .. کوڕە باوکم ویژدان چاکە .. خۆ هێشتا سێ مانگ نابێ پێڵاوم بۆ کڕیوە!!..
ژنەکەی دووبارە لەسەرخۆ و بەلارە ملێوە ووتی:
- بۆ بەسەرمندا دەشیرێنی؟! من چی بکەم.
کاکە حمەد تووڕە تر بوو و زیاتر نەڕاندی:
- هەمووی خەتای تۆیە .. ئەو منداڵەت هێندە بەناز و نوز فێرکردووە تەنانەت هەنگاوێک بەبێ پێڵاو ڕێ ناکا.. ئەگەر تۆ دایکێکی باش بوویتایە ئەو منداڵە ئەوەندەی پێڵاو نەدەدڕاند!..
ژنەکەی کاکە حمەدی هێندە شڕودڕ و درێژدادڕنەبوو، بڕیاریدا کێشەکە تاوتوو بکات و سەرقاپی پێ ڕۆکا ڕاست بەرەو لای کوڕەکەی چوو داخی دڵی خۆی پێ ڕشت و قیژاندی:
- ئەرێ ڕۆڵە تۆ نەخۆشی پێڵاو دڕانێت گرتووە؟ باوکت حەقیەتی ناراحەت بێت .. خۆ هێشتا سێ مانگ نابێ پێڵاوی بۆ کڕیویت .. ویژدان و پیاوەتی شتێکی چاکە .. بۆ پارەی لە ئاوی ڕووباران هەڵ دەهێنجێ؟
کوڕەکەی بەشەرمێکەوە وەڵامی دایەوە:
- دایە گیان بەخودای خەتای من نیە .. ئێوە بۆ خۆتان لەمن باشتر دەزانن جاران جووتە پێڵاوێکم ساڵێکی ڕەبەق لەپێ دەکرد. پێڵاوی ئێستا هەمووی خراپ و بێ کەڵکن .. پێڵاو فرۆشەکان ویژدانیان نیە و پێڵاوی ڕزیو نەبێ بە خەڵکی نافرۆشن!
دایک و کوڕە پێکەوە چوونە دوکانی پێڵاو فرۆش و لێ یان پرسی:

- بۆچی پێڵاوی ڕزیو بەخەڵکی دەفرۆشن؟!..
خاوەن کۆگاکە وەڵامی دایەوە:
- ئەوە هەر تەنیا ئێوە نین کە لە دەست ئەو پێڵاوانە هاوارتان لێ هەستابێت.
هەرچی کریار هەیە هاواریەتی .. بۆ خۆشم هەروام، بەڵام چارەچی یە، زەمانەگۆڕاوە .. کەس ویژدان و ڕەوشتی جارانی نەماوە .. من بڵێم چی ..؟ خەتای پێڵاو دروەکانە ..
دایک و کوڕە و پێڵاو فرۆش وێکڕا چوونە لای پێڵاو دروو و لێ یان پرسی:
- ئەرێ براله ئەوە بۆ پێڵاوی توند و تۆڵ نادرووی..؟!
پێڵاو دروو وەڵامی دایەوە:
- خەتای من نیە .. جووتە پێڵاوێکی ئێستا دوو ئەوەندەی پارەی جارانی تێدەچێ و هەربێ سوودیشە. بازرگانەکانی جاران پیاو و موسڵمان و خاوەن ویژدان بوون .. شتی چاک نەبوایە نەیان دەهێنا .. بەڵام ئەمڕۆ کەس گوێ ناداتێ .. پێستەکان خراپ و ڕزیون من بڵێم چی؟
دایک و کوڕ و خاوەن کۆگا و پێڵاو دروو هەموو پێکەوە چوونە لای بازرگانی پێستە فرۆش و لێیان پرسی:
- بۆ چەرمی خراپ و ڕزیو دەفرۆشی؟!
بازرگانی چەرم فرۆش وەڵامی دایەوە:
- کام بازرگان پێ ی خۆشە توخمی خراپ بفرۆشی؟ بەڵام چبکەم .. زەمانە خراپ بووە

خوو وڕەوشتی خەلکی هەموو گۆڕاوە .. خەڵکی ئێستا ویژدان و ڕەوشت و پیاوەتییان لە بیرچۆتەوە .. تائێستا سەرم بەچەند کارخانەی چەرم دروستکردندا کردووە، هەموو هەرچەرمی خراپ و ڕزیوە دروستی دەکەن.
دایک و کوڕ و خاوەن کۆگا و پێڵاو دروو و بازرگانی چەرم فرۆش تێکڕا چوونە لای خاوەن کارخانەی چەرم دروستکردن و لێ یان پرسی:
- بۆ پێست و چەرمی خراپ و رزیو دروست دەکەن؟
خاوەن کارخانە وەڵامی دایەوە:
- ئێوە ڕاست دەفەرموون، بەڵام من چی بکەم، .. خەتای من نیە زەمانە خراپ بووە
دایک و کوڕ و خاوەن کۆگا و پێڵاو دروو و بازرگانی چەرم و خاوەن کارخانە چوونە لای لێپرسراوی کوشتارگا ((مجزرە)) و لێ یان پرسی:

- بۆ پێستەکان بەچاکی و ساغی ناگروون؟!
لێپرسراوی کوشتارگا وەلآمی دایەوە:
- من بڵێم چی؟ لەم سەردەمەدا نەک تەنیا خوو ورەوشتی خەڵکی بەڵکە خوو و رەوشتی ((گا)) یەکانیش هەر گۆڕاوە .. خۆمن پێستی خۆمتان پێ ناقرۆشم .. ئەوە گایەکانن پیستەکانیان خراپ بووە!
هەموو پێکەوە چوونە گەوری ((گا)) یەکان .. لێ پرسراوی کوشتارگا هەوساری گایەکی گرت ووتی!
- ئەی گا .. ئەوە تۆ تەریق نابیتەوە، ئابرووی من لە لای ئەم هەموو خەڵکە بەڕێزانە دەبەی؟
لە نێو چەوانی تۆی ((گا))وە هەرچی بەدەمیان داهاتووە پێ یان کردووم .. جاران پێستی ئێوەی گاگەل پتەو و توند و جیڕ و چاک بوو .. ئەدی ئەوە بۆ ئێستا واخراپ بووە .. ها؟
((گا))ی بەستەزمان ملی کەچ کرد و وەلآمی دایەوە:
- ئێمەی گاگەل هەنووکە خەتامان نیە .. ئێمە لە بەرامبەر ئادەمیزاد دا کە خاوەنی پێست و گۆشتی ئێمەن چ دەسەلآتێکمان هەیە .. گوناە گوناهی خۆتانە. ئەو کا و جۆیەی کە خاوەنەکانمان دەماندا تێ نیوەی زیاتری گڵ و خۆڵە .. بەو ئالیکەش پێست و گۆشتی ئێمە لەمە باشتر نابێ .. ئێمە گوناهمان چیە .. بڕۆن خوو و رەوشتی خۆتان بگۆڕن.
هەموو دەردە دارەکان لە پێشەوە و ((گا))ی بەستەزماتیش بەدوایانەوە کەوتنە ڕێ و چوونەلای خاوەن ((گا)) و لێ یان پرسی:
- بۆ کا و جۆی خاوێن و باش نادەی بەگایەکان تاپێست و گۆشتیان وەکو جاران ساغ بینەوە؟!
خاوەن گا وەلآمی دایەوە:
- ڕاست دەفەرموون بەلآم من بێ گوناهم .. ئەوە هەموو خەتای ئەو (کاکە حەمەد)ە بێ ئابروو و چاوچنۆکەیە کەخاک و خۆڵ و ووردە بەرد تێکەڵی کا و جۆیەکەی دەکات و بە ئێمەی دەفرۆشێ .. ئەم دەستەیە هەموو پێکەوە لەگەڵ خاوەن گا و ((گا))یەکەدا پێکەوە چوونە لای ((کاکە حەمەد)) و لێیان پرسی:
- بۆ گڵ و خۆڵ و ووردە بەرد تێکەڵ کا و جۆی دەکەی؟
کاکە حەمەدیش هەروەلآمەکەی ئەوانی دووپات کردەوە:

- من بڵێم چی .. خوو و ڕەوشتی خەڵکی گۆڕاوە، زەمانە تێکچووە .. جاران جووتە پێڵاوێکم دووسێ ساڵ لەپێ دەکرد بەڵام ئەمڕۆ دووسێ مانگیش ناکات! .. نەک هەر پێڵاو .. پۆشاک .. خواردن .. خانوو .. دەرمان .. هەموو شتێک هەرگران بووە .. منیش بۆ دابین کردنی ژیانی ژن و ماڵ و منداڵم ناچارم بکەومە فرت و فێڵان لەنیشەکەمدا .. چ بکەم زەمانە گۆڕاوە، ئابڕوو و ویژدان نەماوە دەردەدارەکان هەموو تێکڕا سەیرێکی یەکتریان کردو.

بەسەربادانەوە دەستیان بۆ قسەکانی کاکە حەمەد لەمل داو تەنانەت ((گا))یە بەستەزمانەکەش چەند جارێکی سەربادا..

---

لە کتێبی ((زمانە خراپ شدە))دوە وەرگێڕدراوە - چاپخانە و پیرۆز )لە ٥ / ١٩٨٣ قەلادزێ.

ناوەڕاستی یەکەی خۆی «سیتا»بوو، بەڵام هەر بەسامپینگەکە گوڵێکی زەرد ڕەنگی بۆن و بەرامە خۆش بوو، بانگ دەکرا. هەر لەزووەوە «پادما»ی دایکی بە سامپینگەی بانگ دەکرد هەربۆیەش ئەو ناوەی بەیەکجاری بەسەر دابڕا . باوکی بەرهەمی خانەوادەی کۆن و نەجیب زادەی ژان بوو، دوای پەرت و بڵاو و کردنەوە و بەم لاولادادانی ماڵ و سامانەکەی بەمەرگی بێ وادە چوو، جگە لە قەرزێکی زۆر و پارچە زەوییەکی کەم لە ((کانگری)) نزیکی ((بەنگالۆر)) هیچی دیکەی بۆ ژن و دوو کچەکەی ((لاکشمی وسیتا)) بەجێ نەهێشت.

((پادما))ش کە لە خانەدان و ئەشرافە گەورە لێ کەوتووەکان کەوتبووەوە، ناچار بوو شان بداتە بەر بەخێو کردنی منداڵەکانی و بەجۆرێکی واشی دەژیاندن ببێتە سەرمەشقی کەسانی دیکە. لە دواییشدا بە هۆی نەهاتی و ووشکە ساڵی ناچار بوو داوای کۆمەک و یارمەتی لە هاوسێکانی بکات و تەنانەت دەست لەو کەسەش پان کاتەوە، کە لە سەردەمی دەست ڕۆیشتوویی و بوونی خۆیاندا بەخۆیان گرتبوو و چاودێریان لێ کردبوو و داڵدەیان دابوو. تاوای لێهات ئەو پارچە زەوی یەی کە بۆیان!) مابووەوە، بەنرخێکی زۆر هەرزان بەسوود خۆرێکی چاوچنۆکی بفرۆشێ.

سەرەڕای ئەوەش، کڕیاری چاوچنۆک هات کچە گەورەکەشی ((لاکشمی)) هەر لێ خواست. پادما لەبەر ئەوەی هەمیشە لە ئاینده و چارەنوسی منداڵەکانی دەترسا و لە دڵیشدا چارەی ئەو سوود خۆرە بەد نەژادەی نەدەویست، بەڵام هەرخێراش بەو کارە ڕازی بوو.

دیمەنی پان و پۆر و بەرینی دۆڵی ((گوڵ مەرگ))ی پێش هەیوانی ماڵەکەیان تا چاو بڕی دەکرد ڕاکشابوو و تەمێکی تەنک شەپۆلی دەدابەسەریەوەو پڕشنگی خۆرەتاویش خەرمانەیەکی بازنە ئاسای ڕەنگینی لەو بەرزیەوە دابوو.

لەبەر هەندێ بیر و باوەڕی ئەفسانەیی ئەو دۆڵە هەروا بە چۆڵ و هۆڵی مابۆوە. زۆر جاران پادما ئەفسانە و سەرگوزەشتەی ئەو دۆڵەی بەمجۆرە و بەدرێژی بۆ منداڵەکانی دەگێرایەوە:

((لە زۆر کۆنەوە، پێش ئەوەی سپی پێستەکان بگەنە هیندوستان لەم دۆڵەدا بوونەوە

ڕانیگی ئالدیار بەو پەڕی خۆشی و بەختیاری و شادکامی و بی غەم و ئەندیشە ژیانیان بەسەردەبرد. لەبیر ئەوەی گوێ یان نەدەدایە کارەقورسەکانی مرۆڤە مەرگنەکان هەمیشە وەکو منداڵان ئاسودەو بێ غەم دەژیان)).

((بە دەنگ و ئاواز و گۆرانی یە دڵگیرەکانیانەوە بە دەوری دارستانە چڕوپڕو جوانەکانیاندا دەخولانەوە.

((هەموو تێکڕا خێزانێک بوون. ئەخۆشییان دەنێو دانەبوو. کە پیر و کەنەفتەکانیان وەختی مردنییان دەهات، مردن هێندەی بەسپایی دەفڕاندن هەروەک دەخەوێکی قووڵ ڕابچووبن.

خواردنییان ئەنیا بۆن و بەرامەی گوڵان بوو و لە کۆشک و سەرایەکدا دەژیان هەمووی لە زێڕو زیو و دوڕ و یاقوت دروست کرابوو و باغچەی وەک (سوارابح) کەمەل و باڵندەی باڵ زێڕیان تێیدا دەخوێند دەوروە دەرابوو.

((کاروپیشەی ڕۆژانەشیان هەر دڵداری و گەڕان و سووڕان بوو بەناو دار و درەخت و جەنگەڵی ئەو ناوەدا و بەحەز و ئارەزوویەکی ئەوتۆوە خەریکی ساز و ئاواز و گۆرانی و هۆنراوە و دروست کردنی پەرستگا لە بەردی گران بەها و بەنرخ بوون. بەدزیەوەش لەگەل مرۆڤان، بەتایبەتی هونەرمەندانیاندا تێکەڵ بوون و لاسایی هونەرە بەرز و جوانەکانی ئەوانیان دەکردەوە، چونکە ژیانی ئەو مرۆڤە پڕ بزاڤانە دەتکوت لەگەل جوانی و شیعر و ئاوازدا پێکەوە لە دایک بووبن.

((تا ڕۆژێکی مرۆڤە سپی پێستەکان هاتنە ئەو سەر زەمینە و دەستگای دڵڕیاندن و بۆن گرتنی ئەو گوڵ و ڕیحانانەیان لێ دامەزراند و لەگەل سەرەتای بەهارێکی دڵفڕێن دا دەستگاکانیان کەوتنە کار و بۆن و بەرامەی ئەو گوڵ و ڕیحانە گوشراوانە بەو ناوەدا بڵاو بووەوە، کە زۆر لە بۆنی خودی گوڵەکان تیژتر و بۆندارتر بوو، ئەو بووەتەوەرە بەستەزمانانە هەموو تێکڕا بەرەو ئەو دەستگایانە کەوتنە خۆ ڕاتان و دەوریان لێدان و دەستیان کرد بە هەڵمژینی خێرا و بەپەلەی ئەو بۆنە کەسکوتانەی ئەو گوڵە گوشراوانە. لە بەر تیژی و کەسکووتی ئەو بۆنانەش هیچ یەک لەو بووەتەوەرانە خۆیان ڕا نەگرت و هەموو تێکڕا بە بۆن کەوتن و قڕانیان تێکەوت و ئاقەواریان لێ بڕا و هەموو تێدا چوون.

((لەو ڕۆژە بەدواوە ئەو دۆڵە چۆڵ بوو و کارخانە و دەستگاکانیش ئاگریان تێبەربوو و

ئەو تۆڵە جوانە بەهەشتە بووە جێ ی دڕندە و گەزەندەی کێویان و هەرکەسێکیش ڕێ ی کەوتبایە ئەو ئەو تۆڵە بەشێوەیەک لە ناو دەچوو هەر مەپرسە.

هەرجارێک کە سامپیتگە گوێ ی لەبەسەرهاتی ئەو داستانە دەبوو کارێکی گەورەی دەکردە سەربیرو هۆشی و شوێنەوارێکی گەورەی لە مێشکیدا بەجێ دەهێشت و هەر ووشەیەک بەشێوەیەک وێنەیەکی ئەفسووناوی لە خەیاڵیدا دەچەسپاند. زۆر جارانیش پرسیاری دەربارەی ئەو بوونەوەرە خۆشبەختانەی ئەو شوێنەی لە دایکی دەکرد. ئەویش کە هەرگیز لە دووبارە کردنەوەی بەڵام و ڕوونکردنەوەکانی لەو بارەیەوە، وەڕەز نەدەبوو و واش دەرەخسا زۆر جاران زیاتر و ناوالحتی خۆشی کە پێ ی چاک بایە دەخستە سەری.

سامپیتگە لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا دایکی مرد. مردنی دایکی هەژاندنی لە بەر ئەوەش کە خوشکەکەی و هێرتە سووە خۆرەکەی بەهەرالەی نیشتەجێ بوونیان دەچوونە ((بەنگالۆر)) ئەویشیان لەگەڵ چوو. ئەو پێشهاتە بۆ سامپیتگە زۆر گرنگ بوو چونکە ((سیوا))ی هاوسەری ئایندەی کە هەر لە منداڵیەوە ناوی ئەویان لێ هێنا بوو لە بەنگالۆر مجێوری پەرستگای گاتشا ((فیلی خودا)) کوڕێکی دڵ چەسپ و لە هەمان کاتیشدا تەمبەڵ و نەوەدزەل و هەوەسباز و ئالۆش بوو و هەمیشە سەرقاڵی کێژو کاڵان بوو، لەگەڵ ئەمەشدا سامپیتگە هەرگیز ئیرەیی لێ نەدەکرد و لە دڵی نەدەگرت. ژیانی گۆڕانێکی وای بەسەردا نەهات، کارو ئەرکەکانی ناو ماڵی ئەنجام دەدان و چاودێری خوشکە دووگیانەکەی دەکرد و گوێ لە مشت و گوێ ڕایەڵی فرمان بوو. هەمیشە لە بیرو لێکدانەوە و گێژاوی خەیاڵی خوداییان و قارەماناندا خولی دەخوارد. لە ڕواڵەتدا وەکو هەموو کەسانێکی تری دەژیا بەڵام لە ڕاستیدا مرۆڤێکی گۆشەگیر بوو و لەگەڵ خەیاڵە چڕو پڕەکانی دەروونی خۆیدا خەریک بوو.

سامپیتگە کە دەستی بەتاڵ دەبوو، زۆر جاران دەچووە سەردانی دەزگیرانی لەبەردەم دەروازەی بتی گەورەی گاتشادا کە سەری فیل و ئەندامی وەک ئادەمیزاد بوو لە بەردی ((حەجاری)) دروست کراو و بەرۆتێکی هەیلەوڕەش هەتوابوو. پەرستگایەکە بەبازنەی گوڵی ((مەگرا)) و داوێتیشی بەگەڵای ((ئەسپەک)) ڕازابوەوە بۆن و بەرامەیەکی توند و تیژی گۆگرد و بخوور لە میحرابەکەیەوە بەهەوادا بڵاو دەبوەوە و ((سیوا))ش نیوە ڕووت لەسەر گرتەکەوە بەرزبارەتکاران پێدەکەنی. سامپیتگە بەو خوو و ڕەوشتە سادەیە و بیرە

ساکارەیەوە کە ڕۆژێک دێ بەپێ ی یاسایەکی چەسپا و لەگەڵ سیوا دا دەبنە یەک، خۆشی دەویست. لەگەڵ ئەوەشدا لە نزیک بوونەوەی پیاوان دەترسا و دڵە ڕاوکەی لێ هەبوون و لە بیر لێکردنەوەیان دەتاسا.

تۆ بڵێ ی ئەو کیژە لە کەسانی دیکە جیاوازتر نەبێ؟!

وەک لە شـــاری ((بەنگالۆر)) ســـەربەست تر بێ وابوو، لە ((لەعلی باغ)) دا کەباغچەیەکی پڕدارو درەخت بوو زنجیەکی بەرامبەر بەو دەریاچە دەستکردەی بە گوڵ و ڕیحانە و چڵ و چێوی دەورە دراو بۆ خۆی دروست کردبوو. دوو قاز لە ناو ئەو ئاوە سەوز ڕەنگەدا زۆر بە ئارامی و لە سەرەخۆیی مەلەیان دەکرد و دەهاتن و دەچوون و ئەویش لەناو ئەو زنجەدا خۆی دابووە دەست ئەو بیرو بۆچوون و خەیاڵ و ئەندیشە چرو پڕانەی کە خۆی بۆ خۆی دروست دەکردن و هەربەو هەوایەش ڕووی دەکردە کیشودری سەیر و سەمەرەو بەسپایی دەکەوتە نێو ئەوبیر و باوەڕ و بۆچوونانەی پەیوەندییان بە خودایان و قارەمانانەوە هەبوو کە لە مێشکی خۆیدا بەر جەستەی کرد بوون و تێیاندا دەهات و دەچوو ولێکی دەدانەوە. وا پێــدەچوو وەک بەچاوی خــۆی لەش و لارو ئەندامی ئەو قــارەمــانانەو پاڵەوانیەتی ئەوان لە نزیکەوە ببینێ وای دەنواند بیرو ئەندێشەی ئازاد و سەربەستی سەردەمی منداڵانەی خۆی لەگەڵ ئەو بگرەو بەردەو بەیەکداهاتنانە تێکەڵ دەکرد هەمیشە بیرێک خەیاڵی ئەوی ناراحەت دەکرد.

تەندروستی خوشکەکەی تا دەهات خراپتر دەبوو. مێردەکەی ناردی یە نەخۆشخانەی ((ڤاینوبلاس)) و بۆ چاودێری و ئاودەنگیش سامپینگەی لەلامایەوە. زۆر جاران بۆ دڵدانەوەی خوشکەکەی دەستی دەکرد بەگێڕانەوە و باسکردنی سەر زەمینی ((گوڵ مەرگ)). بەڵام خوشکەکەی لەبەر ئازار و ژانی خۆی گوێ ی نەدەدایە هیچ و چ ئاگای لەم بەسەرهات و باس و خواسانە نەبوو. مانەوەی سامپینگە لەو نەخۆشخانەیەدا بارێکی واناڵەباری بۆ هێنانە پێشێ بۆ خۆشی بەخەیاڵیدا نەیەت.

بۆنی دیتۆڵی ناو ڕاڕەوەکان و هاتن و چوونی پەرستار و فیزو ئیفادە و خۆبادانی دکتۆر خانمی ئینگلیزی و برین پێچ و تەنانەت نەخۆشەکان و ئەوانەش کە دەهاتنە سەردانی کەسە نەخۆشەکانیان بۆ ئەو شتێکی چاوەڕێ نەکراوبوو. خوشکەکەی ڕووی لە خراپی بوو. هەر چەندە مێردەکەشی ناقایل بوو بەڵام سەرۆکی نەخۆشخانە فەرمانی نەشتەرگەری

دەرهێنانی منداڵەکەی هەر دەرکرد..

سامپینگە زۆری سەر لەو شتانە دەرنەدەچوو، تەنیا ئەوەندەی دەزانی کە خەتەرێکی گەورە لە رێ ی خوشکەکەیدایە.

نیوەرۆی بەیانی ئەو رۆژە زانی کە نەشتەرگەرییەکەیان کردووەو خوشکەکەی داوای سامپینگەی کردووە بۆ ژوورەکەی خۆی.

لاکشمی بەرووالەت وای خۆپیشان دەدا کە نووستووە، بەلام رەنگی وەک بەهێ ی زەردی لێ هاتبوو و شەلالی ئارەقە ببوو. رەشێنەی چاو و کولم و کونە لووتەکانی شێوەیان گۆرابوو و لێوەکانیشی ووشک هەلاتبوون. هەرکە زانی سامپینگە هاتە ژوورێ چاوەکانی هەلێنان و زۆر بە نائومێدی و کەساسییەوە تێ ی راما.

سامپینگە بەسپایی لێ ی نزیک بۆوە و زۆری هەوڵ و تەقەلالادا تا دەنامێزی خۆی وەرێنا.

خوشکەکەی بە ووشەی لاواز و پچرپچرەوە ووتی: ((زۆرم رەنج کێشا لە منالی ئەو پیاوەی، ئەو شتەی کەلەمنی چاوەرێ بوو، کورێک بوو تا وەجاغی کوێر نەبێتەوە، ئەوا ئەو بە ئارەزووی خۆی گەیی و درێژە بە ژیانی خۆی دەدا. بەلام بەختیاری و خۆشگوزەرانی بۆ کەسانێکی وەک ئێمە لە سەر رووی ئەو زەوی یە هەلگیراوە و بوونی هەرنییە. ئەو هەمیشە پێ ی دەووتم:

((من خۆتم لە راهی خودا لە دایکت خواست. کەچی تۆ خوشکەکەشت کردە نان خۆر و جێ گری من؟)) زۆرم پەرۆشی تۆبە بچۆوە بۆ ((کانگری)) بۆ لای پوورە کەنەفتەکەمان، یان هەر نەبێ لەگەڵ ((سیوا)) دا زەماوەندبکە..))

پێدەچوو هەولێکی زۆر بدا ئەو ناراحەتیە دەروونییەی خۆی وەشارێ کەدووچاری ببوو. بە روخساری شێواو و ماندوویەتییەکی زۆری دەردانەوە، لەگەڵ هەلوەراندنی فرمێسکە گەرمەکانیشدا دەستی بەرووەمەتەکانی سامپینگەدا دەهێنا.

دوایی پێ ی ووت: ((دەستەکانم بگوشە)) سامپینگە دەستەساردو سرەکانی خوشکەکەی دەنێو دەستی خۆی نا، دەوەدەمەیدا کە گوێی لە نالە پرسۆزەکەی بوو، چاوی خوشکەکەی دیت ئەوق ساون و لە مۆلەق وەستاون، دەست و برد رایکرد و داوای پەرستاری کرد و خێرا پزیشکی هێنا، بەلام بێسوود بوو، تا پزیشکی گەیشتێ ئەو تەواو

ببوو. زۆری نەخایاند کەوتنە شووشتن و پاک کردنەوەی جێ و بانەکەی.
سامپینگە کە لە دەرگای نەخۆشخانەکە وەدەرکەوت خۆی لە دەست هێرشی غەم و خەفەت و بیری ئالۆز رزگار کرد، هەرکە گەیشتە سەر شەقامی گەورەش هەستی بە ئارامی و ئاسوودەییەکی خۆش کرد، بەڵام زۆری خۆبێ پشت و پەناو بێکەس هاتە بەرچاوان.
چ بکا؟ سەر لە نوێ بچێتەوە لای کابرای سوود خۆر و چاوچنۆک؟ ئەمەیان هەرنا و بێ ئاگا بەرەو ئەو گردەی کە پەرستگای ((گانشا)) ئارامی لێ گرتبوو کەوتە رێ. سیوا لەگەڵ کچۆڵەکی سەرگەرمی قسان بوو. کە سامپینگەی دیت کچۆلەکەی بەجێ هێشت و بەرەو لای ئەو هات. سامپینگە بەبێ ئەوەی وورتەی لە دەم بێتە دەرێ بەسەرسامییەوە تێ ی راما. ئەویش دەستی گرت و بردیە پشت پەیکەرەکەی بتی گانشا. سامپینگە ووتی: ((من زۆر بێ پەنا و بێکەسم. دەکرێ لەمەودووا لەگەڵ تۆدا بژیم..!؟))
((ئاه. ئێستا نا..! چونکە منیش زۆر نەدار و دەست کورت و بێ نەوام دەبێ ماوەیەکی دیکەش راوەستی.))
دەستی درێژکرد و لە ئامێزی خۆی ناو بەسینگی خۆبەوە گوشی، ئەویش هێندە دەستە پاچە ببوو هیچ بەرگریەکی پێ لە خۆی نەکراو هەر لە گێژاوی چ بکاو چ نەکادا دەخولایەوە. بەراستی پێویستی بە نەختێک ئاسوودەیی هەبوو، بەڵام هەستی بێزارییەکی توند هەموو گیان و مێشکی داگرت.
سیوا سەری لە بناگوێ ی نابوو و لەسەرخۆشتێکی دەچرپاندە گوێ یەوە و بەسپاییش بەخۆبەوە دەنووساند.
سامپینگە تەنیا بۆنی ئارەقی تیژ و ماسولکە پتەوەکانی و هەناسە پچرپچرەکانی ئەوی هەست دەکردو دەستەکانی بێ ئاگایانە بەلەش و لاری ئەودا دەگێران.
ئەو لەو کاتی نائومێدی و بێ هیوایییەیدا بۆ تاوێک ئاگای لە خۆی برا، دوایی لەگەڵ ئەو رەنگە پەرپوەیەی و هەموو ئەو بێزار ییەیدا خۆی لە باوەشی سیوا راپسکاند و دەرپەری.
ئەو هەموو گاشە بەردە حەجیمانەی ئەو خودایەی سەربان ناوە بەسینگی ئاسمانەوە، کە سامپینگە هەر لە منداڵیەوە پێیانەوە خەریک بوو و ببوونە جێی متمانە و بیر و باوەری و رێزی لێدەنان و لێ یان دەترسا، بەراستی ئێستا لە بەرچاوی ئەو هەرچی هێزو توانا و

ناو و ناوبانگیان هەیە لە دەستیان داوە و هەموویان شتێکی بەتاڵ و هیچ و پوچوبێ مانا خۆ دەنوێنن.

سیوا لەو سڵ بوونەودیەی ئەو ڕامابوو، لە ترسان ڕەنگی پێ نەمابوو و هەر بۆیەش هەردوو شانەکانی توند گرتبوون.

سیوا ووتی: ((ئەوڕۆ زۆر سەیر دیاری..!))

سامپینگە بەچەند ووشەیەکی پچڕپچڕەوە وەلامی دایەوە: ((ئەگەر دەتزانی..!؟))

دوایی لە پەدەستەکانی بەرووی خۆیەوە ناو هەلات. سیوا تاخوار گردەکە چاوی لێ نەتروکاند. هەستی تەنیایی و بێکەسی پەرێشانی کردبوو و لە دلی خۆیدا دەیووت: ((ڕەنگە باری ئەم گوزەرانە بۆ خەلکی دی سوودمەند بێ. بەلام بۆ من نا.))

لە پڕ شتێکی بە مێشکیدا هات ئەو وەکو خەلکی دی ڕانەهاتبوو .. بۆ؟ ئەو ماندوو بوو ماندوو بوونێک تا لێواری مەرگ. هەموو شتێکی لاپووچ و بێ مانا بوو. تەنانەت لە دەزگیرانەکەشی بێزار بوو ئەو دەیویست لە خودا و ئەو قاردمان و پالە وانە قوڵ و بازووە تێکسمڕاو و توند و تولانە و ئەو پەیکەرە قنجانە نزیک بێتەوە، ئەوەتا ئێستا وایدەزانی کە هێزو توانای خۆی هەموو لەو فیداکاری و قوربانیانەدایە کە لەگەل مێردەکەیدا لە ژێر سێبەری ستوونەکانی پەرستگای گانشا داژیان بەرێتەسەر، بەلام وا ئێستا دەبینێ کە ئەم بیروبۆچوونانەی هیچ مانایەک نابەخشن و هیچ سەرەنجامێکی نیە و ژیانی لەگەل سیوادا بەم شێوەیە قەت پێ ناچێتەسەر.

سامپینگە ڕق و کینەیەکی تەواوی لەو کەسە خۆپەرست و بەرهەلداو هیچ و پووچانە لە خۆیدا هەست دەکرد کە دەیناسین.

شەقامەکە تابلێ ی چۆل و هۆل و بەدرێژایی خۆی ڕووت و ڕەجال و ناخۆش دەهاتە بەرچاو. لەسەری کولانێکدا چەند منداڵێکی سەلک و بنک لەبەردەمی دووکانێکدا خەریکی یاری کردن بوون و کۆمەلێک هیندی چوار مەشقی لە جێ ی پەرینەوەی شەقامەکە دانیشتبوون تووتنیان دەجوی.

ئەو ئارام و بێدەنگی و چۆلییەش تا دەهات زیاتر یان توورە و تۆسن تر دەکرد و لەگەل ئەو گێژاوی دەروونیەی ئەودا یەکانگیر نەدەبوونەوە و لەگەل یەکدا نەدەگونجان، هەر بەدەم ئەوڕێ ڕۆیشتنە نارێک و پێکەیەوە لە پڕ خۆی لەبەردەم باغچەی ((لەعلی باغ)) دا

دیتەوە، لەبەر ماندویێتی و لاوازی و بێ تاقەتیش رووی کردە کەناری دەریاچەکەو لەسەر لاتەختێک لێ ی کەوت.

بەهیوای ئەوەی لە دەست ئەم چەرمەسەرێ و بگرەو بەردەوکە شمەکەشەش رزگاری بێت، کەوتە بیری خۆ کوشتن. لە تەواوی ئەو ساتانەشدا هەر بەلای ئەودوە دەچوو کە بە ئاسانترین رێگا چاو لە جیهان بپۆشێ و ووردە ووردەش دەستی بەبسکەکانی خۆیدا دەهێنا. تائەمرۆ بەمل کەچی و مەمرەومەژی ژیاوە، بەلام ئەو گرفتاریەی دووچاری ببوو وای لێکرد ژیانی لەلا تاڵ بێ وچیدی نەتوانێ بەمجۆرە ژیان بەسەربەرێ.

سەرەتا لە رەنگی سەوز و قوولایی ئاوەکە راما، لە پڕ چاوی پەرییە سەرگوڵی پادما ((گوڵێکی گەورەی نەیلوفەری هیندی یە)) کە پەلکی تابلێ ی گەورە و پانە و ناوی دایکیشی بوو. لە پڕ بەبۆنی ئەو گوڵ و گەڵاو گژ و گیایانەی دەوریان دابوو سەر زەمینە ئەفسووناوییەکەی ((گوڵ مەرگ))ی هاتەوە یاد. تووشی سەرەگێژەیەکی ناخۆش بوو. لە پڕ بە هۆی ئەو گۆڕانە دەروونییەی بەسەری داهات وای بیر کردەوە کە یادگار و بیرەوەرییەکانی رابردووی لەگەڵ ئەو بوونەوەرە نادیارانە لەبەرچاوی بەرجەستەن و هۆشیشی تادێت لەو تەک و تەنیاییەدا بەهێزترو تیژتر دەبێت.

لەوانەشە ئەمجۆرە بزاڤت و گۆڕانە هەست پێ نەکراوانە، تەنیا بەسەر کەسێکدا بێن کە هەست دەکەن لە جیهانێکی ترەوە بانگهێشتن دەکرێن و تروسکە رووناکییەکی تایبەتی کەبەئەنجامدانی کارێکی زۆر گرینگ و خەتەرناک لەخۆیانیدا دەبینن، کەئەویش روو بەرووبوونەوەی مەرگ و مردنە. لەبەر ئەوەی هەر لەزووەوە لەوێ ژیابوو، ئەوێ زۆرچاک شارەزابوو. لەپڕ سۆزێکی یەکجار بەگوڕ سەرتاپای داگرت لەبەر ئەوەی دەیویست بەیەکجاری خۆی لە دەست ئەو رەنج و دەردو مەینەتی و ژان و ژوارەی ژیان رزگار بکات. هەر لەو ساتانە دا هەموو شتێکی فەرامۆش کرد. ئەوەی بیری لێ نەدەکردەوە خۆ کوشتن بوو. چونکە دەیویست تازووە بگاتە بەرزترین قۆناغی درەخشان و لووتکەی بیر و لێکدانەوە و بۆ چوونەکانی خۆی.

هەستی بەحەسانەوە و ئارامێکی لەسەرخۆی دەروونی خۆی کرد. وەک لە شوێنێکی نادیارەوە بانگی کەن، لە نزیکەوە دەنگێکی خواوەندانە بە نەرمی دەهات و دەیووت: ((ئەی سامپینگەی شۆخ و شەنگ دەوەرەوە لای ئێمە، ئێمە دەتپارێزین، خۆ تۆ هی ئەم

دنیایە نیت، هاتنت بۆ لای ئێمە زۆر گەورە و بەرێزە))
سامپینگە جوانترین جل و بەرگەکانی خۆی پۆشیبوو و دوو رووپیە و چەند ئانەیەکیشی لە گیرفاندا بوو، کە دەیتوانی بەو پارەیە بگەڕێتەوە شوێنی لە دایکبوونی و بگاتە کەناری دۆڵی قەددغە و لەگەڵ بوونەوەرە نادیارەکانی ئەوێ ئەگەر هیچیان مابن بژیەت بۆ بۆنی گوڵی ئەو شوێنە سەرمەست و کاس بێت و کۆتایی بەو مۆتەکە دەروونییەی خۆی بێنێ.
لەدەوروبەی سەعات پێنجی بەیانی زوو، کە تازە باران باریبوو، بۆنێکی خۆشی پاک لە زەوی هەڵدەستا.
سامپینگە وەک کچۆڵەیەکی پەری ئاسا، بەجلە جوان و بەدەن چەسپەکانیەوە سەرمەست و کاس بوو. ((گوڵ مەرگ)) تا چاو بردەکا بەرەنگی هەمە جۆر و خاکی خۆڵەمێش رەنگی کە رووناکییەکی کەم داپۆشیبوو تاچاو ئەندازێکی دوور بەدرەخت و گوڵی ((مەحوەر)) داپۆشرا بوو و چوار دەوریشی بە گوڵی سوور تەنرابوو درێژ دەبووەوە. دەودەمەیدا کە خۆرەتا و تازە دەهات بەتیشکە زەردە زێڕینەکەی خۆی زەوی دەئامێز بگرێ، سێبەری سامپینگە هەروەک نەبووبێ وابوو.

۲۹ / ۳ / ۱۹۹۷ دارەتوو

## سوپاس و پێزانین:

سوپاس و پێزانینێکی زۆرم بۆ تێکڕای هەریەک لەم زاتانەی خوارەوەیە، کە هەریەکەیان لەلای خۆیەوە کۆمەک و دەستەوە گرویی ئەم بەرهەمەیان کردم:

١- مامۆستا عبد القادر عزیز سعید

٢- بەڕێز ئازاد احمد اسماعیل

٣- بەڕێز شێرکۆ شێرزاد احمد

٤- کچی خۆم پاوان غریب پشدەری

**(غەریب)**